# ڕێگای یاخییان

ئاریز عەبدوڵڵا

چاپی دووەم
هەولێر ٢٠٠٥



لەبڵاوكراوەكانی سەنتەری لێكۆڵینەوەی فیكریی و ئەدەبی نما

زنجیرەی( ٤٨ )

سەرپەرشتیكردنی چیرۆك و رۆمان
زرار سەرتاش

ناوی كتێب:رێگای یاخیان

نووسینی: نارین عەبدوڵڵا

دیزاین: نما

تیراژ: 500

چاپی دووەم: هەولێر ٢٠٠٥

پێشکەشە :

بە هەردوو برادەری خۆشەویستم :

- کاک عەبدوڵڵا بۆر
- کاک کەمال حاجیاغا

# نوێژی سەر کانییەکی چۆڵەوانی

## دلشاد عەبدوللا

میللەتان چۆن مێژووی خۆیان دەنووسنەوە؟ ئەو نهێنییە هەمیشە درەنگتر پەی پێ دەبردرێ، وەلێ ئەوەی دەزانرێ ئەوەیە کە، لە قۆناغە جیاکانی مێژوودا قوربانیدان و گیانفیدایی هەوێنی سەرەکی مانەوەی میللەتان بووە. ئێستاش کە فاکتەری دەرەکی کاریگەری گەورەو دیاریان هەیە لە چارەنووسی میللەتاندا، بەڵام هەرگیز فاکتەری ناوخۆ پشتگوێ ناخرێو هێزی جوڵانەوەی ناوەوەو ڕادەی بەرپرسیاریێتی و ڕادەی هەستی نەتەوەیی دەتوانن ملی چارەنووس بە قازانجیخۆیان بادەنەوەو باش سوود لە فاکتەری دەرەوەش وەربگرن . میللەتێکیش هیچی لە بار نەبێ باری حوشتریشی بۆ بکەن بە ئاڵتوون نابێتە خاوەنی هیچ !

وەکو چۆن کەسایەتی سەرکەوتوو لە هەموو بوارەکانی ئەفراندندا بە خۆ هیلاک کردنو شەونخونی و جدیەت بەرهەم دەهێنرێ ئاوهاش میللەتان بە فیداکاریو خۆڕاگریو گیانی لە خۆ بوردوویی، نەمریو سەرفرازی بە دەست دێنن بە تایبەتی لە ڕۆژگارە تاریکو نوتەکو پڕ کارەساتەکاندا .

خەباتی سەختی لە ڕادەبەدەری سەردەمی پێشمەرگایەتی ڕوویەکی درەوشاوەی فیداکاریو بەرخۆدانی کورد دەردەخەن بە

تایبەتی لە ڕۆژگارە دژوارەکاندا، ئەو کاتەی دوژمنانی کورد گەلەکۆمەکیان لە دژی گیانی ڕزگاریخوازی کورد کردووەو ترۆپکی ئەو دژوارییەش لە سەردەمی ئەنفالەکاندا بووە .

ئەگەرچی قسەو گفتوگۆ زۆرە دەربارەی دروستیو نادروستی خەباتی چەکداری لە قۆناغە جیاوازەکاندا، بەڵام دەبێ ئەو ڕاستییە هەمیشە لەبەر چاوان بێ کە کورد زۆربەی جار بە ناچاری پەنای بردۆتە بەر چەکو ڕووی کردۆتە شاخ بۆ خۆ پاراستنو بەرەنگاری، ئەگینا کام میللەت لە دنیادا هەیە خۆی ئەو ژیانە دژوارە هەڵبژێرێ کە کەمترین ئاستی شارستانی تێدا نیە .

من کاتێ هەندێ لە بیرەوەریەکانی ڕۆژگاری پێشمەرگایەتی دەخوێنمەوە، یادە تاڵەکانی ناو دەفتەری بن باخەڵ و ناو هەگبەو کوڵە پشتی ئەو دێوانە شۆڕشگێڕانە دێنمەوە بەر چاوان، هەمیشە ئەو ڕاستیەم لا جێگیرتر دەبێ کە ئەو عەشقە دەروێشانەی نیشتمانو بیروباوەڕ نەبێ مەحاڵە کەسێ بتوانێ بەرگەی ئەو هەموو دەردە سەریو میحنەتو کێشەو ئازارانە بگرێ . وا نەبوا کێ مەزەندەی دەکرد هێزێکی بچووکی هیلاکو ماندووی دوای شکستی ئەنفال بتوانێ لە خاکێکی سووتماکی چۆڵو ترسناکدا بمێنێتەوەو ببێتە دڕکی بەر پێی هێزی زەبەلاحی داگیرکەرو بەرگەی ئەو هەموو هێرشو ترسو برسێتیو نا ئارامیو بەرچاو لێڵییە بگرێ کە ئەوسا بەهۆی پەلاماری دوژمنانەوە دروست ببوو .

لە بیرەوەریەکانی کاک ئارێزو پێشتریش لە بیرەوەریی پارتیزانەکانی تردا لە تەک ئەو یادە تاڵو ناخۆشانە بینینی جوانیەک هەست پێدەکرێ ، خۆشەویستییەکی ڕاستەقینەو شێتانە بۆ نیشتمان بە هەموو وردەکاریەکانیەوە، خەونێکی پیرۆز

بۆ ئایندەیەکی گەش‌و ڕووناک. هەر بۆ نموونە لە بیرەوەرییەکانی کاک ئاریزدا ئەو هەموو وەسفە بۆ شیعرییەتی سروشت‌و ڕووداوەکان بە ڕووداوە ترسناکەکانیشەوە بە جوانی هەستی پێدەکرێ .

پێشتر ئەو جۆرە جوانییەم لە دەفتەری بیرەوەری پارتیزانێکی تردا لە مامەڵەکردنی لەگەڵ ڕەوتی چۆلەکەیەکی ناو خاکێکی سووتاودا خوێندۆتەوەو ئەو جۆرە پەیوەندییە زۆر جار لە دوای ڕامانێکی ئینسانی بێ وێنەوە دەخوڵقێ ، ئەو کاتەی مرۆڤ خۆی‌و سروشت بە تەنیا دەمێننەوە، هەوڵدەدا لە ڕێی ناسکترین هەستییەوە قسە لەگەڵ سروشتدا بکات‌و هێزە گەورەکانی بکاتە پشتیوانی خۆی‌و هێزە شەڕانگێزەکانیش خەفە بکات‌و لە ئەنجامی گفتوگۆیەکی هێمنەوە بازنەیەکی ئارام لە ناو ژینگەیەکی ترسناکدا بۆ خۆی دروست بکات .

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەو ڕووداوە گرنگانەی مێژووی گەلەکەمان تا ئێستا وەکو مادەی خامیش تۆمار نەکراون، چ جای ئەوەی بکرێن بە کەرەستەی کامێراو فیلمسازی، بۆیە ئێستا هەر بە تەنیا تۆمار کردنیان وەکو خۆی کارێکی گرنگ‌و بە بایەخەو هیوادارم هەڤاڵانی کاک ئاریز چاو لەو بکەن‌و نەهێڵن لانی کەم ئەو سامانە نەتەوایەتییە بفەوتێ .

# گەشتی یاخییان

ڕۆژێك لە ڕۆژەكانی مانگی گوڵان، لە ئاوایی دەلاشی دەڤەری بارزان لەسەر نانخواردن بووین، بە ڕێكەوت ئاوڕێكم لەو ئەسپە دایەوە كە لەولای ئێمەوە بەسترابووەوەو ئەویش خەریكی ئالیك خواردن بوو. هەر بەو ئاوڕە، ئەسپەكە سەرنجی بۆ لای خۆی ڕاكێشام‌و دواتریش بووە سەرچاوەی ورووژانی چەندین یادەوەری دژوار، خاوەن ماڵەكەش هەستێكی كردو یەكسەر پرسی: ئەسپێكی چۆنە؟ بەم پرسیارەی سەرنجی لەسەر ئەسپەكە هەڵبڕیم‌و منیش وەڵامم دایەوەو گوتم:

– ها.. جوان‌و بەهێز دیارە.

لەبەر هەر هۆیەك بێ، كابرا لە خۆیەوە دەیویست هەندێك باسی ئەسپەكەی بكات‌و گوتی:

–ئەم ڕۆژانە لە گوندێكی لای (بجیل)م كڕی.. وا دیارە جارێكی تریش دەبێ بار بكەینەوەو لە ترسی كیمیایی‌و ئەنفال رابكەینەوە، هەر لەبەر ئەوە بۆ مەبەستی دەربازكردنی منداڵەكانم كڕی.. ئەو كەسەی ئەم ئەسپەم لێی كڕی حیكایەتێكی سەیری لە بارە دەگێڕایەوەو دەیگوت:

–ئەم ئەسپەم لەبەر دەركی ماڵی خۆمدا گرتۆتەوە. درێژەی پێدەداو دەیگوت ئەسپەكە ڕۆژێكی تۆف‌و تووشی زستانی ڕابردوو بە هەر چوارپەل خۆی چۆتە بەر دەرگای ماڵی كابراو ئەویش

دەیگرێتەوەو دوای ئەوەی بە دوای سۆراخی خاوەنەکەیدا دەچێ بۆی دەردەکەوێ کە ئەسپەکە لە بنەڕەتدا هی دەستەیەك پێشمەرگەبووە کە لە چیای بێراتێ لە ناو بەفردا ڕەق بوونــــەتـــــەوە...

* * * * *

ئەسپی پێشمەرگان! ... پێشمەرگەی لە بەفردا ڕەق بووەوە! ... ئەسپی بەڕەڵا.. زستانی ڕابردوو! .. لای بجیل! .. چیای بێرات... لە مێشکمدا دەزرنگانەوەو جینگڵیان دەداو لە ناسینەوەی ئەسپەکەو ڕاستی سەرنجەکەم دڵنیایان کردمەوەو وەبیرم هاتەوە کە ئێوارەی ١/٢٢ کە یادی چلو دووەمین ساڵڕۆژی دامەزراندنی کۆماری کوردستان بوو. ئێمەش دەستەیەك پێشمەرگەی نۆ کەسی لەسەر چاکی مام سۆفی سەر بە پەڕ، لە گوندی بابەجیسکی خەیلانەتی هەردوو ئەسپەکانمان بارکردن‌و ڕۆژئاوا لەگەل هەرسێ دیلە جاشەکان بەرەو بادینان بەڕێ کەوتین ،هەرچەندە ئێوارەیەکی دژو تەڕو تووش بوو، بەڵام پێمان وابوو ڕۆژێك زووتر بڕۆین باشترە، چونکە کورد دەڵێ: زستان خۆت دوا مەخە، بەهار خۆت تەڕمەکە.. تا ئەو ڕۆژەش هەواڵمان هەبوو کە بەفر ڕێگاکانی نەگرتبوون، بۆیە چیتر خۆمان دوانەخست‌و بەڕێ کەوتین.

* * * * *

هێشتا بەڕێ نەکەوتبووین هەوا دەیپرووشکاند. هەرکە بەرەو سەرزێش جوڵاین‌و شۆڕ بووینەوە باران دەستی پێکردو ئیدی لە سەرەوەڕا باران لێی دەداین‌و لە ژێرەوەشڕا قوڕ وەك موگناتیس بەرەو ناخی زەوی ڕادەکێشاین. دەشتی هەریریش لە کاتی باران باریندا دەبێتە دەقنەیەکی یەك پارچە قوڕی خەست‌و جیڕ، جا

وەرە بەو تاریکە شەوەو بەو بارانە ئەو دەشتە دوورو بەر درێژە ببڕە؟... دەڕۆیشتین‌و ناوە ناوەش پێڵاوەکانمان لە ناو قوڕدا لێ بە جێدەمان ، بۆیە ناچار دەبووین بە دەست بە دوایاندا بگەڕێین‌و بە زەحمەتێکی زۆر بیاندۆزینەوە. بەم شێوە ڕۆیشتنەش زۆر هیلاک دەبووین‌و لەبەر ئەوەیش زۆربەی خەڵکی گوندەکانی سەر ڕێگا جاش بوون، دەبو بەلا ڕێی ناو کەندو چەم‌و دوورە ئاواییدا بڕۆین. کاتێکیش کەوتینە بەر شۆقی گڵۆپەکانی گوندی خڕێ، مام جەوهەر گوتی:

—ئۆخەی خۆ گەیشتینە خڕێ.

منیش پێم گوت:

—خەمت نەبێ جارێکی دیش دەگەیتەوە خڕێ!

چونکەخڕێ ناوی ژنەکەی ئەویش بوو لە بادینان چاوەڕوانی دەکرد. دەڵێن هەندێك جار مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە، بەڵام لە ناو ڕەوتی مێژوودا هەڵوێست‌و وێنەو قسەو پەندەکان.. هەمیشەو بەردەوام دووبارە دەبنەوە. زستانی حەفتاو پێنج ڕۆژێك باوکم‌و دەستەیەك پێشمەرگەی هاوڕێی لە حاجی ئۆمەرانەوە بە مۆڵەت بەرەو ماڵ دەگەڕێنەوە لە ڕێگا هەوا دەگۆڕێ‌و ئەوانیش لەبەر زریان‌و بەفر زۆر هیلاك دەبن‌و دوای زەحمەتێکی زۆر دەگەنە نزیکی شارۆچکەی خانێ، کە لە مەترسی بەفرو زریان دەربازدەبن حەمەدی خەجیجە ڕەشێ‌ی هاوڕێی باوکم بەرامبەر بە شارۆچکەکە ڕادەوەستێ‌و هەناسەیەکی قوڵ هەڵدەکێشێ‌و دەڵێ:

—ئۆخەی نەمردم ئەمجارەش گەیشتمەوە خانێ!

باوکیشم پێی دەڵێ:

—هێشتا ماوتەو جارێکی دیش دەگەیتەوە خانێ!

چونکه، ناوی ژنەکەشی خانێ دەبێ .
ئەو ساتەی ئەو قسەیەم لەگەڵ مام جەوهەر کرد هەمان قسەی باوکم هاتەوە بیر ، بەڵام نازانم داخوا بەهۆی ئەو قسەیەی باوکم بوو بەم شێوە وەرامی مام جەوهەرم دایەوە یان ، بەهۆی وەرامەکەم بوو بەسەرهاتو قسەکەی باوکم هاتەوە یاد! ؟

* * * * *

بەهۆی رەوشی نالەبار لە رێگەدا زۆر دواکەوتین، بەڵام لە کۆتاییدا بە هیلاکییەکی زۆرەوە هەر گەیشتینە سەر زێ، زێ چ زێ! ! زێی بادینان ئەوەندە هەستابوو خوێنی دەکرد. هەڤاڵێك بە فیکە فیکەیەکی تایبەت بەرەو ژێرو ژووری زێیەکە داکشاو هەڵکشا تا لە چاڵێك بە هەمان ئاواز وەڵام درایەوە، ئەوەش ئاماژەو نهێنی شەومان بوو لەگەڵ ئەو کەسەی کە بە مەبەستی پەڕاندنەوەمان لەوێ ئامادەبوو. ئامادەبوونی کەلەکوان لە کات شوێنی خۆیدا مایەی دڵخۆشی بوو، بەڵام کەلەکوانەکە لە دواکەوتنمان نیگەران بوو، نەبادا فریای پەڕینەوە نەکەوین. کەلەکەکە لە چوپو دار دروستکرابوو، بە کەرەتێك جێگەی هەموومان نەدەبووەوە، بۆیە دەبوو بە چەند کاروانێك بپەڕینەوە، جاری یەکەم چەند هەڤاڵێك پەڕینەوە، ئینجا ئەسپەکانمان بە ئاو دادان و ئەوانیش بە مەلەوانی پەڕینەوە. کەلەکوان دەچوو، دەگەڕایەوە. نۆرەی ئێمەش هات و پەڕینەوەش بەو تاریکە شەوەو لەو زێیە زەبەلاحەو بەو کۆنە چوپانە کارێکی دژوارو پڕ لە مەترسی بوو، چونکە کونێکی بچوك لە چوپەکە بەسبوو بۆ ئەوەی کارەساتێك ڕوویدات. هەر چۆنێ بێ ئێمەش سواربووین و جوڵاین، لەسەر ئاوەکە هەستمان دەکرد کەلەکەکە ئاوو ئاو دەچوو! چونکە زۆر بە خوڕ دەڕۆیشت و کەلەکوانیش ماندوو ببوو، بۆیە باش تاقەتی بە سەوڵ لێدان

نەدەشکا. لێزمەی بارانو هاژەی زێی هارو هاجو شەپەشەپی شەپۆلان لە ناو تاریکایی شەوێکی بێ دادو بێ ئاماندا سەمفۆنیای مەرگ نەبێ هیچی تری نەدەگەیاند.. دەڕۆیشتینو شەپۆل بە شەپۆلی دەسپاردینەوە.. هەرچەندە کەلەکوانەکە زۆری دەخوری بەڵام کەمی دەبڕی... هەتا ڕادەمام ئەمسەرو ئەوسەری زێیەکە هەر دیار نەبوون.. ئەو ساتانەش هەستم دەکرد لە ناوەڕاستی ئۆقیانووسێك داین نەك زێی بادینان!... تا هەنگاوێك بەرەو ئەوبەر دەچووین شەپۆلەکان بیست هەنگاویان بەرەو خوار دەبردین.. دەتگوت : زێش حەز دەکات لەسەر شەپۆلەکانی خۆیدا بەرەو دوا هەواری خۆی ڕاپێچمان بکات یاخود، دەستی لێبەرنەدەبووینو نەیدەویست بەجێی بهێڵین؟. هەنگی کاتو شوێن مانایەکی تریان دەبەخشی، چونکە چرکەیەك لە کاتی ناهەمواردا ماوەیەکی حسابیەو هەنگاوێکیش لە شوێنی سەختدا مەودایەکی زۆرەو کەم نییە، بۆیە لەوێ زەمەنو شوێنیش درێژ دەبوونەوەو ئێمەش لە چاوەڕوانیو پەرینەوەدا تەنیا ئەوەندەمان لە دەست دەهات کە توند دەست بە شوڵە دارەکانی کەڵەکەکەوە بگرینو هانی کەڵەکوان بدەینو چاویش ببڕینە ئەو کەنارەی کە تاریکایی نەیدەهێشت هەرگیز بیبینین.

* * * * *

لە جێگایەکی دوور لە شوێنی مەبەست لەنگەرمان گرتو لەگەڵ هەڤاڵان یەکترمان گرتەوە. سەیرمانکرد کات ناهەموارو دژوارە ، بۆیە بە پەلە پەل بارەکانمان لێنانەوەو کەڵەکوانمان لە نزیك گوندی قەسرۆك بەجێهێشتو خۆشمان بەرەو باکور ملی ڕێگەمان نا. هەرکە لە کەڵەکوانەکە دوور کەوتینەوە دڵنیابووین کە تازە ڕێگەی گەڕانەوەمان نەماوەو دەبوو هەرچۆنێ بێ بە ناو

بنكەو مۆلگەكانی دوژمندا بڕۆین و نەگەڕێینەوە. ئەوبەری زێش هەر قوڕو زێلاقی جارانبوو، بەلام بۆ ئەوەی لە ناودەستی دوژمنان ڕۆژمان لێنەبێتەوە زیاتر پێمان هەڵێنان و لەگەڵ (كات)دا لە ململانێیەكی توندا بووین.. شەو دەیویست بارگەی خۆی بپێچێتەوەو شوێن بۆ ڕووناكی خۆر جێبهێڵێ و ئێمەش دەمانویست پێش ئەو ڕووداوە بگەینە شاخ و ئەو دەشتە جێبهێڵین، چونكە تەنیا تاریكیبوو لە چاوی دوژمنانی دەپاراستین، ئای تاركی بۆ ڕێبوارانی كاروانی روناكی چەندگرینگ و بەسوودی.. بەلام چیی بكەین لێرەدا نەیدەتوانی لەوە زیاتر خۆی لەبەردەم كازیوەی بەیاندا ڕابگرێ و ڕانەكا. بە تەنیشت گوندی شەرەفۆنادا ڕۆیشتین و بە پێچ و پەنا جادەی (قەندیل- ئاكرێ) مان بڕی و بەرەبەیان جاشەكانی گوندی نێروە ئێمەیان دی و هەندێ دوورە تەقەشیان لێكردین، بەلام هەر بە سەلامەتی گەیشتینە بناری چیای كڕپس و تازە لە دوژمن بێ منەت بووین و شاخی پشت و پەنای هەمیشەییمان دیسان داڵدەی داینەوە... ئەی شاخ هاتین و ناگەڕێینەوە.

* * * * *

ئەو بنارە چەند ماڵە مەڕدارێكی لێبوون، چووینە لایان و بەو بەرەبەیانە لە خەومان قیتكردنەوەو ئەوانیش خێرا خێرا وشكە ساوارێكیان دەرخوارد داین، دیاربوو دەترسان و حەزیان دەكرد هەرچی زووترە ئەوێ بەجێبهێڵین، بۆیە كە پرسیاری ڕێگەمان لێكردن گوتیان:

– هێندە بەفر نەباریوە گیرابێ!

نامەقیشیان نەبوو، چونكە ئەگەر دوژمن تەنیا هەواڵی چوونی ئێمەی بۆ ئەو ماڵانە زانیبا ئەوەندە بەس بوو بۆ ئەوەی ئەنفالیان

بكات. هەر لەناو ماڵەكان چووینە دەر بەفر پێشوازی لێكردین و دنیاش تەواو ڕووناك بووەوە.. كە لەوێ سەیری خوارەوەمان كرد دیتمان لە دوژمن زۆر نزیكین، بەڵام دوژمن پێی وانەبوو بەو ڕۆژە دژو تووشە پێشمەرگە خۆیان لەو ڕێگە سەختە بدەن دەنا هەرچۆنێك چاودێری ئەو ناوەی كردبا ئەوا بێگومان دەبینراین و ئەو كاتیش تەقەیەك هەر دروست دەبوو.
بەفر دەباری و تازیاتریش دەڕۆیشتین ئەستوورایی بەفری باریو پتر دەبوو. لە قولانجێك بوو بە بستێك و بوو بە دوو بست و سێ بست و تا سەرووی ئەژنۆیان هات.. لێرە بەولاوە بە نۆرە بە پێش دەكەوتین و كوتەكمان دەشكاند ، بە هێزترین پێشمەرگەش نەیدەتوانی لە چەند دەقیقەیەك زیاتر بەفرەكە بشكێنێ، تا دەشهات بەفر بە گوڕتر دەباری و تەمتومانیش وەك ڕەشماڵێكی سپی خۆی بەسەر چیاكەدا هێنابووە خوارێ . هەرچەندە چیای بێراتێ چیایەكی بەرزو دوورو درێژە، بەڵام لەبەر تەمتومان و بارینی بەفر دووری چەند مەترێك زیاترمان نەدەدی و شارەزاش نەبووین، خۆ ئەگەر شارەزاش باین ئاسەواری هیچ ڕێگەیەك دیارنەبوو، بۆیە خواو ڕاستان ملمان لێنابوو بێ ئاوڕدانەوە سەر دەكەوتین و دەچەووینە پێش. كە گەیشتینە سەر چیاكە لەوێ ئەسپەكانمان بە تەواوی لە بەفردا خەتم بوون و لەوە زیاتر نەیانتوانی ڕێبكەن هەرچەند هەوڵماندا داكت چیا ، بابت چیا سوودی نەبوو، كەوتن و هەڵنەستانەوە.
لە جێگایەك لە تەنیشت لوتكەی كۆریس و بەرامبەر بە چیای پێرس و لەسەر لوتكەیەكی هەرە بەرزی چیای بێراتێ گرفتی یەكەم ئەسپەكانمان لە بەفردا خەتم بوون و خۆشمان هێندە ماندوو بووین هەر ئەوەتا دەجوڵاینەوە. لەناو بەفر بووین، بەفر ج بەفر

وەك پەمۆی ناو قۆزاخە سپی‌و نەرم، سپی وەك كفنی ناو دەستی دایكە شەهیدێك كە بۆ رۆڵە تاقانەكەی بشەكێنێتەوە دەهاتە بەر چاوان.

—مەڤالآن ئەگەر لەسەر ئەم چیا بەرزەو لەناو ئەم بەفرە سپیەدا رەق ببینەوە ئەوا ئەم بەفرە پاكە دامان دەپۆشێ‌و دەبێتە كفنمان، بەلآم بەهارێ (چۆرچۆرەی دەكەوتە بنێ)و ئەوسا خوێنمان بە ناخی شاخدا دەباتە خوارێ‌و لەوسەر تێكەڵ بە ئاوی سازگاری كانییەكان دەردەكەوینەوەو دەخورێینەوەو تێكەڵ بە خوێنی هاو زمانەكانمان دەبینەوە.. ئەدی ئێمەش بە هەمان شێوە خوێنی رەچەڵەكی خۆمان نەخواردۆتەوە؟ بۆیەشە لە دین دەبین، بەلآم لە خوێن نابین؟

— چ نیعمەتێكی خواییە مرۆڤ لە لوتكەدا بمرێ‌و بەفریش دایبپۆشی؟

— ئای داگیركەر چەند ستەمكاری! ئەوە لەبەر ستەمی تۆیە ئێمە لەولآتی باو باپیرانماندا ئەو رێگە سەختانە دەگرینەبەرو بەو بەختەوەری‌و شانازیەشەوە ئەو شێوازە مردنە هەڵدەبژێرین ، دەنا ئێمەش حەز دەكەین وەك گەلانی تر بە جۆرێكی تر بژین؟

بڕیار درا ئەسپەكان لەوێندەرێ بەجێ بێڵین، بەلآم بۆ ئەوەی دوای تێر خواردن‌و پشوودان بتوانن هەستنەوەو بە رێگەی خۆیاندا بگەڕێنەوە.. بارو كورتانەكانمان لێكردنەوە، هەندێ دەورو بەرمان بۆ پەستانەوەو ئالیكمان خستنە بەردەم، كەلوپەلە زیادەكانمان لەناو بەفردا شاردنەوەو شتە پێویستەكانیشمان دابەشكرد.. هەڤاڵێك گوللەی ئارپ بی جی، هەڤاڵێك چەكی زیادە، هەڤاڵێك قاپ‌و مەنجەڵ، هەڤاڵێك دانەوێڵە... ئەوجا بەرەو پێشەوە هەنگاومان نا‌و ئەسپەكانمان جێهێڵآن.

هەر لەو کاتەی کە خەریکی تاوتوێکردنی شتەکان بووین تا بەرێش کەوتینو ئاواش بووین ئەسپەکان دەمیان لە ئالیك هەر نەداو سەیریش چاویان تێبڕیبووین.. وەها لێمان رامابوون من هەستم دەکرد لەگەڵمان دەدوێن، بەڵام زمانیان نەبوو تاتێمان بگەیەنن !، ماتیو مەلولی لە چاوەکانیاندا دەخوێندرایەوەو ئێمەش سۆزمان بۆیان هاتبووە جۆش، بەڵام چ بکەین؟ نەدەکرا بە تەنیا لە ژێر رەحمەتی زریانو بەفردا جێیان نەهێڵین.. تا لەناو بەفرو تەمو مژدا لە یەکتری بزر بووین چەند جارێك ئاوڕم لێیان دایەوە دەمدی هەر وەکو خۆیان هەر سەیریان دەکردینو بە چاوانیش بە دواماندا دەهاتن، دەهاتنو نە دەگەیشتنەوە ئێمە... ماڵ ئاوا ئەسپە جوانەکان ماڵ ئاوا

* * * * *

بەرەو ئەودیو شۆڕبووینەوە، ئەو دیویش جەنگەڵێکی چڕ بوو، بەڵام تەراشو دەوەنەکان خۆیان لە ژێر بەفردا ماتکردبوو ، بنەدارو لکە بەرزەکان نەبێ دیارنەبوون. هەرچەندە چوونە خوارەوە لەسەرکەوتن ئاسان تربوو، بەڵام تەراشو دەوەنو تریکە شاخ جێی مەترسیەکی زۆربوون. بە نەدیتەیو نەشارەزایی زوو زوو دەکەوتینە ناو تەراشانو نێوان بەردانو دەبوو هەموو جارێکیش بە زەحمەتێکی زۆرلەناو چاڵە بەفرو تەراشان بێینە دەرەوەو خۆمان ڕزگار بکەین.. ئەو دەردە بۆ ئەو هەڤاڵانەی کە کورتە باڵا بوون سەخت ترو دژوارتر بوو. لاقی هەندێکمان بریندار بوونو خوێنیان لێدەچۆڕایەوە ، بەڵام تەنیا ڕۆیشتن دەرمان بوو . هەرچەندە ڕێگەکە بێ ئەندازە سەخت بوو، بەڵام هەر دەبو بیبڕین، چونکە لە نێوانی مردنو برینی ئەو ڕێگە سەختەدا

شتێکیتر بەدی نەدەکراو، کێش هەیە حەز بکا یان، لێبگەڕێ بە سووکو ئاسانی بمرێ ؟
لەناو تووشیو تۆفێکی چڕدا جار جارە دنیا ڕووناك دەبووەوەو ناو دۆڵەکەمان لێ بە دەردەکەوت ، بەو دەرکەوتنە هەندێك ئومێدی خامۆش بوومان دەگەشایەوە، کەچی هەرچەندە بێ وەستان دەڕۆیشتینو شۆڕدەبووینەوە هەر نەدەگەیشتینە خوارێ. چەند جارێك لە ڕازە شاخەکاندا عاسێ بووین، بەڵام ڕێرەومان دەگۆڕیو دەرباز دەبووینەوە. بە تەواوی هیلاك بووینو لێرە بەدواوە دیلەکانیش وەکو ئێمەیان لێهاتو سروشت ئازادیکردن، خۆ ئەگەر بەرەڵامان بکردبانو ڕێگەشمان بدابان بڕۆن هەر نەیان دەتوانی لە ئێمە جیاببنەوە. لەوێ لەسەر بەفرو لە ژێر بەفردا کاتێك لەو بڵندیە لە چوار کەناری خۆمان دەڕوانی سروشت تابلۆیەکی ڕەشو سپی ئەفسوناوی هەست ووژێنی دەنواندو بەردەوامیش دەیگۆڕیو هی تری نیشان دەدایـن... دڵمان لەنێوان ئومێدو مردندا کوتە کوتی دەهات.
ئێوارەبوو، لە ناو قەدی چیا، دیتمان بن لاتە شاخێك بەفر نەیگرتۆتەوە، بە هەلمان زانی لەوێ بێنێك بدەینو نانێك بخۆین ،چونکە هەم زۆر هیلاكو هەمیش زۆر برسی بووین. پریاسکەو چەکەکانمان دانانو لەگەڵ جولانەوەی قاچەکانمان دەستمانکرد بە نانە ڕەقەخواردن، نەش دەبوو هیچ لە جولە بکەوین ،چونکە ئەگەر گیانمان خاو بووبایەوە ئەوا نەمان دەتوانی زیاتر بڕۆینو بێگومان لەوێ ڕەق دەبووینەوە. نانەکانمان زۆر کەم بوونەوە ناچار بووین ئەوەندەی مان دابەشیان بکەینو هەریەکەو نانێکمان بەرکەوت.

نیسان شەکەت و شەقی بە لەشی تەڕەوە کەوتینەوە ڕێ. برۆ.. برۆ.. بەفرمان دەشکاندو ڕێگەمان دەبڕی، بەڵام دەتگوت دۆڵەکەش لەبەرمان رادەکات و نایەوێ دالْدەمان بدات ، هەر دەڕۆیشتین و هەر نەدەگەیشتین! . ڕۆژئاوا بە هەرچی حاڵێك بو نشێوی چیای بێراتمان بڕی و خۆمان لەناو دۆڵەکەدا دۆزیەوە ئەوجا ئۆخەیەکمان لە خۆمانکرد... گەیشتینە هەوارێك و ما بارگە دانیشین.

* * * * *

ئەو دۆڵە تەنگەبەرە قوڵ و پڕ لە دارستانە لە نێوان چیاکانی کۆریس و بێرات و پێرس دایە و لە بێخمەوە دەست پێدەکات تا دینارتە درێژ دەبێتەوە. ئێمە بەڕێی بێخمەدا شارەزابووین، بەڵام بەرەو ڕۆژئاوا واتە دینارتە شارەزا نەبووین، تەنیا ئەوەمان دەزانی هیچ ئاوەدانی لێنییە و خەڵکەکەی ڕاگوازراوە. لە شوێنێك سەرمان دەرهێنابوو شارەزای نەبووین و نەمان دەزانی کێندەر کێندەرێیە. چەند لە بێخمە یاخود، دینارتە دوورین؟ بەڵام، ئەوەمان دەزانی کە ئەگەر چیای پێرسیش ببڕین بە ئاسانی دەگەینەوە هەوارەکانمان.

ئەدی چیای پێرس چۆن دەبڕین؟! . ئەو چیایە هێندە سەخت و بەرزە لە هاویناندا سەرکەوتن و دابەزینی پیادا زەحمەتە، نەخاسمە بەو چلەی زستانە و بەو بەفرە زۆرە! .

لەناو دۆڵەکەدا نەکات و نە هێزی ڕۆیشتنمان مان. تا دنیا بە تەواوی تاریك بوو بە دوای ئەشکەوتێك یان، نوانێکدا گەڕاین، کەچی بێ سوود بوو. بۆ ئەوەی لەسەرمان ڕەق نەبینەوە بڕیارماندا ئاگرێکی گەورە بکەینەوە و لە بەختی ئێمەش ناو دۆڵەکە دارستانێکی هێندە چڕبوو خڕکردنەوەی داری وشك

ئەرکێکی زۆری نەدەویست. ئەوجا بە ماوەیەکی کەم هێندە مورە داری وشکمان لەسەر یەکتری کەڵەکە کردن تا بەیانی بیانسووتێنین کۆتاییان نەهێت، کەویستمان ئاگرەکە بکەینەوە هەرچەند گەڕاین و سوڕاین هیچ پووش و پەلاش و چیلکەی وشکمان دەست نەکەوت. من بیرم لە کۆڵە پشتەکەی خۆم کردەوە کە ڕۆمانی (کاریتە یان ئەودیو چیا)ی یەشار کەمالی تیادایە. هێشتا نەمخوێندبووەوە، بەلام پێویستی ژیان ئەوەی دەخواست کە لە جیاتی خوێندنەوە ئاگری پێبکەینەوە. بەم شێوەیە لەوێ لەو دیو چیا بە کاریتە یان ئەودیو چیا ئاگرێکی گەورەمان کردەوەو دەیان کاریتەمان پێ سووتاندن.

* * * * *

ئاگرێکمان کردەوە ، ئاگر چ ئاگر! مەگەر ئاگری وەها لەناو حیکایەت و ئەفسانەکانی کوردەواری و ڕۆژی نەورۆزو سەردەمی زەردەشت بینرابێ و بیسرابێ دەنا نەبووەو نابێ...! بڵێسەی ئاگرەکە لە ناو کلوە بەفرە بە خوڕ بارپوەکاندا بۆ تاقی ئاسمان هەڵدەکشاو ئەو ناوەی لەناو ئەو شەوەزەنگو تەمتومان و بەفرەدا کردبووە نوێژی نیوەڕۆ. چوار دەورەی ئاگرەکەمان داو ماوە ماوەش داری زیاترمان دەخستە سەری، بەلام هەر چەندە بیرمان دەکردەوە ئەو شەوە درێژە بە ئاسانی کۆتایی نەدەهات؟ دەبوو لە سەعات پێنجی ئێوارەشەوە کە تاریک بوو تا سەعات حەوتی بەیانی ڕۆژی دواتر بەو شێوەیە هەڵبکەین..
شەوی یەلدایە یا، دەیجورە ئەم شەو...
ئەم شەوە درێژە چۆن و کەی کۆتایی دێت..؟! ئەو پرسیارە خەستبوونەوەی هیلاکی و گومانی بەرگەگرتن بوو لەو بارودۆخە ناهەموارەی کە تێی کەوتبووین. کاتێکیش لەگەڵ شەوی پێشووتر

بەراوردمان دەکرد دەماندی درێژی شەوی یەکەم سوودمەندو هی دووەمیش زیان بەخش بوو، بەوەش بایەخی هونەری کەڵك وەرگرتن لە کاتو شارەزایی جوگرافیاو هەلو مەرج دەردەکەوت کە ئێمە کەمتر لەو هونەرەمان دەزانی. تا هەنگی بیستو چوار سەعات بوو بەڕێوەبووین. بەو ڕێگا سەختەش.. جا تۆ وەرە چوارده سەعاتی تریش بێ خەوتنو خواردنێکی باش لە ژێر ڕەحمەتی بەفرو ڕووبەڕووی ئاگرێکی دۆزەخیی بە پێوە بوەستینو بەرگە بگرینو نەمرین!.

لەبەر ئاگرە نەورۆزییەکە گیانمان خاوبووەوەو هەستی خەوو خواردنمان زیاتر وروژا. هەر چەندە کێشەی برسێتی چار دەکرا، بەڵام خەو چۆن؟

* * * * *

مەنجەڵێکمان خستە سەر لایەکی ئاگرەکەو پڕمان لە بەفر کرد بۆ ئەوەی بتوێتەوەو ببێ بە ئاو، هەرکە ئاوەکە هاتە کوڵ بانگکرا:

–برنجەکە لای کێیە؟ بیهێنێ.

دەنگ نەبوو. دووبارەکرایەوە، کەس خۆی نەکرد بە خاوەنو ناچار باسی ساوارەکە کراو ئەویش کەس نەیگوت لای منە! ئەی خودایە ئەدی دانەوێڵەکە چی بەسەرهات؟!.

ڕەوشەکە ناخۆشتر بوو، نەمانی برنجو ساوار بێ ئومێدییەکی سەیری هێنایە پێش، خەریك بوو لەسەر ئەوە دەنگە دەنگ دروست ببێ، بەڵام تازە چوو. لە پڕ من بە بیرم هاتەوە کە برنجو ساوارەکە لای تەنیابوو، بەڵام بێ دەنگیم لێکرد، چونکە دەمزانی لە ڕێگادا فڕێی داوە یاخود، لێی بەجێماوە. پاشان کە بەنهێنی بە تەنیام گوت:

—من به دەستی خۆم دانەوێڵەکەم دایە دەستت؟
ئەو ئینکاری نەکرد، بەڵام گوتی:
—لەو شوێنەی کە پشوومان لێیدا لەیادم کردووە.
تازە لە دەستچوو، بەرازیش نەدەگەیشتەوە ئەو شوێنە. بە هەرحاڵ ، ئاوەکەمان نەستاندەوەو هەندێ خوێو رۆنمان تێکردو لەو پێنج قۆدیە گۆشتە سەرکەگایەش کە پێمان بوون سێ دانەمان هەڵپچڕینو خستمانە ناو ڕۆناوەکەو شلەیەکی نایابمان دروستکردو لەبەر ئەوەیش هەم کەم بوو هەم زۆریش برسی بووین، هێندە بە تام بوو کاتێك بە زێرە مەتارە فرماندەکرد هەر لێی تێر نەدەبووین. بەم شێوەو بەو شەوە ساردە تۆزێك هەناومان گەرم بوونەوە. بەڵام، خەوی چاوانمان چۆن ڕاو بنێین؟ ئەوەیان کێشەیەکی گەورەو کارێکی ستەم بوو؟. بە نوکتەو حیکایەت هەندێ خۆمان خەریککرد، بەڵام تێشوو شەو چەرەی قسان بۆ شەوێکی بێداریی درێژو دژوار ئاسان نەبوو، هەرچی دەمانکردو دەمانگوت هەر زوو دەبڕایەوە، تەنیا شەوە درێژەکە نەبێ، کە کۆتایی نەدەهاتو نەدەبڕایەوەو نەدەبڕایەوە.

* * * * *

بۆ ئەوەی هەموو گیانمان لەسەرما بپارێزین لە جێی خۆمان دەسووڕاینو هەموو لایەکمان بە یەکسانی لە ئاگرەکە دەکرد. لەلایەکی دیکە ئاگرەکەش هێندە لە سەرماو لە بەفرەکە سەلامەتتر نەبوو. کاتێك شەو ڕاشکا ناوە ناوە هەڤاڵێك خەو دەیبردەوەو لە پڕ بەرەو ناو ئاگرەکە دەچوو، هەڤاڵانی تری دەیانگرتەوە. کێ هەبوو تا بەیانی چەند جارێك نەکەوێو نەگیرێتەوە؟ لەو شەوە تفوسییەدا تەنیا دوو سێ کەس جلەکانمان نەسووتانو نەسووتاین.

ئای ! ئەم شەوە درێژە نالەبارە چۆن و کەی کۆتایی دێ؟ شەوێك تـا بەیانـی ڕایـەخ بەفـر بـێ و، بالـیف بەفـر بێ و، لیفە بەفرین و، دەوروبـەر هەمـووی هـەر بەفـر بـێ؟! . بۆ سـەیرکردن و ڕامان لەو دەوروبـەرە ئەفسـانەییە چـەند جارێـك مـن لـە ئاگـرەکە دوور دەکەوتمـەوەو هەسـتم ڕادەگـرت: لـەناو ئـەو دۆڵـە تەنگـەدا تەنـیا دەنگـی بـێ دەنگیـی دەبیسـتراو زەویش کش و مات خۆی بۆ بەفر پانکردبووەوەو هەر وەری دەگرت و لە باوەشی دەکردو چاوی لێ تێر نەدەبوو.. ئـەوە چ عەشـقێکە لـە نێوان بەفرو زەویدا هەیەو تاسـەی تامەزرۆییان لـە یـەکتری ناشـکێ و تێر نابن.. ئای خودای بەفرو خاك!
زایەڵـەی کلـوە بەفـرەکان ئاوازێکـی غـەمگین و زەنگـی مەترسـی مردنـی پۆلـێك پێشـمەرگەی وڵاتێکـی خاپـور کراوبوو. دیمەنەکان سـیحراوی بـوون و منـیش شاعیرانە ڕادەمام و لەگەڵ خودی خۆمدا دەدوام، بـەڵام پـێش ئـەوەی تامەزرۆییم بشکێ سەرما بەرەو بەر ئاگـرەکەی ڕاودەنامـەوەو سروشی ئەو ئەندێشانەی پێ دەبڕیم کە خەریك بوو دەبوونە شیعر.
دەوری ئاگـرەکەمان دابـوو، هـەر دەسـووڕاینەوەو جاشـە ئـازادە دیلەکانـیش لاسـایی ئـێمەیان دەکردەوە، لێرە لەبەردەم مەترسی مردنـی هەمـوواندا جاشەکانیش ئازادبوون و ئەو شەوەش بۆ ئەوان سـەد هێـندەی ئـێمە ناخۆشـتر بـوو، چـونکە ئـەوان لـە ڕووی دەروونیشەوە نیگەران بوون و وەکو خۆیان دەیانگوت:
—ئەگەر ئێوە بمرن شەهیدی ڕێگەی ئازادی ورزگارین، بەڵام ئەدی ئەگەر ئێمە بمرین چین؟.

ئەو پرسیارەی ئەوان لەلایەك ورەی ئێمەیان بەرز دەكردەوەو بە بەراورد مردنمان لاشیرین دەبوو، لەلایەكی دیكەش بەزەیم بەوان دەهاتەوە..
زەوی بەفری هەڵدەلووشیو ئاگرەكەش داری هەڵدەلووشین‌و ئێمەش لەنێوانی ئاگرو بەفردا ركابەریمان لەگەڵ مردندا دەكردو ئیرادەی ژیانمان سەر دەخست. ئاگر لرفە لرفی دەهات‌و تا پێش دەچوو زیاتر بەرەو ئاسمان هەڵدەكشا، لەگەڵ ئەوەشدا بەفر وەك رەشماڵی سپی بەسەردا دەهاتە خوارەوەو پێموابێ لە یەك مەتری چوارگۆشەو لەیەك چركەدا سەدان‌و بگرە هەزاران كلوە بەفر دەبارین، كلوە بەفری كەچەپەرۆ دەبارین. هەموو جار نەنكم دەیگوت:
-لەگەڵ هەر كلوە بەفرێكی باریو فریشتەیەك دادەبەزێ تا دەگاتە سەر زەوی ئینجا دەگەڕێتەوە ئاسمان!
ئەو كات بیرم دەكردەوەو لەبەر خۆمەوە دەمگوت: ئەگەر ئەو بۆچوونەی نەنكم ڕاست بێ ئەم شەوە چەند ملیۆن مەلائیكەت ئێمە لەو بێ دەرەتانی‌و بێ نواییەدا دەبینن؟ تۆ بڵێی یەكێكیان بەزەییەكی بە ئێمەدا نەهێتەوەو هەرنا هەواڵی ئەو بی نەوایی‌و لێقەوماوییەمان بۆ سەرەوە نەباتەوە؟
دنیا هەمووی بەفر بووو ئاگرە پیرۆزەكەش لەو شەوە بێئامانەدا بەرگری لێدەكردین‌و نەیدەهێشت وەك دارو بەردو دۆڵو چیاكان لە بەفردا نوغرۆ ببین، بەڵكو دەیویست لە باوەشی خۆیدا هەڵمانپڕوكێنێ، بەڵام لە سەرمان ڕەق نەبینەوە! ئاگری ئەو شەوە زەردەشتی لا خۆشەویستترو بایەخی خۆشی لا پتر كردین، چونكە ئەوەندە پێویستمان پێی هەبوو هەر بە دەوریدا دەسووڕاینەوەو تاوەش هەڤاڵێك وەك پەپولە خۆی بۆ

دەماویشت، بەڵام پێش ئەوەی لە باوەشی خۆیدا هەڵیپڕوکێنێ دوور دەخرایەوەو رێگەی پێ نەدەدرا تامەزرۆی ئاگرەکە بشکێنێ.
– هەڤاڵان وریابن خۆتان هەڵنەپڕوکێنن.

* * * * *

ئاو ڕاوسەتابێ ئەو شەوە بەفرو ئاگرو ئێمەش ڕانەوەستاین.. بەفر دەباری.. ئاگر لرفەلرفی دەکرد.. ئێمەش لە ژێر بەفرو بەرامبەر بە ئاگر دەخولاینەوە. هەر چۆنێ بێ بەرگەمان گرتو ڕۆژ بووەوە، بەڵام لەبەر تەمتومانو بەفر بارین دنیا هەر نیمچە تاریك بووو وەکو شەوی ڕابردووش ئەو دوو قۆدیە گۆشتەی پێمان مابوون لە ناو ئاوو خوێو ڕۆنمان کردنو هەر بە پێوە فرمانکردن. ئیدی لێرە بەدواوە تێشووی سەفەری بەفرمان براو تەقەمان لە بنی هەمبانێ وەهێنا.
چی بکەین؟ پرسیارێك بوو لە مێشکی هەمواندا دەخولایەوە. بەرەو ڕۆژهەڵات بێخەمەیەو دوژمن زۆر قایمی گرتووە. لای ڕۆژئاوا شارەزا نەبووین، بەڵام دەمانزانی تا گوندی ئاماداو دینارتە بێ ئاوەدانیەو ئەویش دوژمنی لێیە. سەیری پێرسیشمان دەکرد زۆر سەختو دژواربوو، دوای ئەو هەمو بەفر بارینە هەڵگەڕان پیایدا مەحاڵ بوو. هەڤاڵ چالاك[✝] دەیگوت:
– پایزی ڕابردوو ئێمە بە ڕێگەیەکدا هاتین بە ناو دۆڵێکدا ڕەتدەبوو، نەك سەرشاخ..
بە پێی تاریفی ئەو ماوەیەك بەرەو ڕۆژئاوا ملی ڕێگەمان گرت، بەڵام بە هۆی بەفری زۆر نەیدەتوانی شوێنەکان بناسێتەوە، کە بێ ئومێد بوو گوتی:

---

✝ لە تاوانە گەورەکەی ئەنفالدا بەدیل گیراو بێ سەرو شوێن بوو .

–من تۆباڵەکە هەڵناگرمو ڕێگەکە نانۆزمەوە.
گەیشتینە ناو کاولە گوندێکی ڕاگوازراو لەوێ هەرچەندە سەیرمان کردو هەستی خۆمان ڕاگرت بەڵکو گوندییەك، ڕێبوارێکمان لێببێتە خدری زیندە، کەسێك پەیا نەبوو.
شوێنەواری ڕێگایەك لەناو گوندەکەدا بەرەو سەر چیا بەدی دەکرا ، ملی ئەو ڕێگایەمان گرت.. پێچاوپێچ دەڕۆیشتین تا گەیشتینە ناو ئەو ڕەزانەی لە بەفردا خەتم بوو بوون. هەرچەندە زۆر زۆر هیلاك بووین، بەڵام لەگەڵ هەر هەنگاوێك سەرکەوتن دڵمان خۆشتردەبوو، چونکە ئەودیوی چیا ئاوەدانی بوو، بارەگاکانی خۆشمان لەوێ بوونو دەمانگوت: ئەگەر بگەینە سەر چیاکە ئەوا دابەزین ئاسانترو خۆشترە. بەو ئومێدە سەردەکەوتین تا لە هیکڕا ڕووبەڕووی شاخێکی سووری دیوار ئاسای چاوەڕوان نەکراوبووینەوە. ئاخ ئەو شاخە چ ئاستەنگێکی گەورەبوو. بەدوای ڕێگایەکدا گەڕاین لەو شاخە عاسییە خۆمان دەرباز بکەین، بەڵام هەندێ چووینو هاتین سوودی نەبوو، نەشدەکرا بە نەشارەزاییو لە قەد چیایەکی وەها سەختدا هەموو وزەی خۆمان بێهوودە بەدوای دۆزینەوەی ڕێگایەکدا بە بادا بدەین، بۆیە بە هەناسەیەکی ساردتر لەو بەفرەی کە دەباریو بە ڕەشبینیەوە جارێکیتر بەڕێی خۆماندا گەڕاینەوەو شۆڕبووینەوە.. بەرەو خوارەوەو بۆ دواوە هەنگاوی سستمان دەهاویشتو وقاچەکانمان بەگرانی بەدوای ویستماندا ڕادەکێشان، تا گەیشتینەوە ناو کاولە گوندی نەقەبو لەوێ دوو ڕێگەمان لە بەردەمدا بوون: بەرەو بێخمە یان، بەرەو دینارتە چوون. باشە چۆن برۆینو چی بکەین؟! من لە دینارتە خەڵکم دەناسی، بەڵام چۆن بگەینە ئەوێ؟

* * * * *

- باشە ئێوە لێرەبن و ئێمە سێ هەڤاڵ دەچین و هەوڵدەدەین بگەینە ناو دینارتەو ولەوێ بەهۆی ناسیاوەکانم بە خواردن و وشارەزاوە دەگەڕێینەوە.
باشە دینارتە چەند دوورە؟، چۆن دەگەن؟ کەی دەگەڕێنەوە؟. ئەگەر لە ڕێگە تووشی دوژمن بوون ئێمە چوزانین؟
هەرچی ڕێگەی دووەم بوو دەبوو بەرەو بێخمە بگەڕێینەوە.. باشە ئەوێ چەند دوورە؟، کەی دەگەین؟ کە گەیشتین چی بکەین؟ وەلامی ئەم پرسیارانە سەخت بوو، بەلام ڕێگاو ئەگەرەکانی دەربازبوون هەر ئەوە بوون.
لە ئەنجامی بیرکردنەوەو پرس و راوەرگرتن بریارماندا بەرەو بێخمە کێل بینەوە. گوتمان ئەگەر رەبایەکانی پارێزگاری بێخمە جاش بوون هەوڵدەدەین تەفاهومیان لەگەڵدا بکەین و ئەگەر تەفاهومیشیان نەکرد یاخود ، رەبایەکان سوپا بوون ئەوا لێیان دەدەین و خۆ ئەگەر سەرکەوتووش نەبین ئەوا لەوێ بکوژرێین باشترە لەوەی لە برسان ولەسەرمان رەق ببینەوە؟

* * * * *

هێشتا بەفر هەر دەکەوت ، ئێمەش بەرەو بێخمە کێل بووینەوە. بەرێوە دەڕۆیشتین و هەریەکەمان بیرمان لە هەزارو یەك شت دەکردەوە. دەڕۆیین و قۆناغ دیار نییە، ڕێگاو هەواریش هەر هەمووی بەفرە بەفر... دۆڵاو دۆڵ دەڕۆیشتین ، کاتی ئێوارە برسێتی و ماندوێتی بە تەواوی تینی بۆ هێنایین. هەندێ لە هەڤالان و دیلەکانیش لە پەلوپۆ کەوتن. دەی هەڤالان، دەی برادەرینە زۆرمان نەماوە چاوەکەم، براینە.. ئەو قسانە هی ئەوانە بوون کە هێشتا رەوشیان باشبوو. لێرەدا لە یەکتری دوورکەوتبووینەوەو پەرتەوازە بووبووین کە ئەوەش نیشانەی

پەککەوتنو جیاوازی وزەو توانامان بوو. هیچ چارمان نەماو لە جێگایەك خڕ بووینەوەو کە ویستمان ئاگرێك بکەینەوە لە چوارکەس زیاتر توانای خڕکردنەوەی دارمان نەبوو. ئەوجارە بۆ ئاگرکردنەوە ناچار بووین چەند حەشوەیەکی گوللەی ئار. بی. جی بسووتێنین.

—باشە چی بکەین؟

توانای ڕۆیشتن نەماوە، شوێنی حەوانەوە نییە، نان نییە.. بەڵام ئەوەی هەبوو باوەڕو ئیرادەی پێشمەرگایەتی بوو، ئەویش تا چەند بردەکاتو چۆن وزەمان دەداتەوە بەر؟

ئەوە ئەمجارەش خۆمان گەرمکردەوە، ئەدی دواتر چی بکەین؟، ئایا دەکرێ هەندێکمان بەجێبمێنینو هەندێکیشمان بڕۆین؟ ئەم پرسیارانەو دەیان پرسیاری ترمان لە خۆمان دەکردن. پرسێتی پرستی لێبڕیبووینو خەویش سەربارێکی زۆر گران بوو بەسەرمانەوە. ئەو ناوە زۆر گەڕاین بەڵکو ئەسپێك، ئێسترێك بدۆزینەوەو سەری ببڕین چونکە بە هۆی ڕاگواستنو قەدەغەکردنی گەرمیانو کوێستان کردن ڕەوەندەکانی سرێشمە هەموو دەوارەکانی خۆیان لەو ناوچەیە بەڕەڵاکردبوون، بەڵام هیچمان بەدی نەکردو تەنانەت چۆلەکەیەك یان، سمۆرەیەکیش! منو دڵشاد کۆیی و نەبەز لەولاتر بە جیا ئاگرێکی بچووکترمان کردبۆوەو خۆمان گەرم دەکردەوەو وەك دەڵێن سەرمان بەیەکەوە نابوو، بێ ئومێدانە بیرمان دەکردەوەو ڕێگە چارەیەکمان شك نەدەبردو دەردە دڵمان بۆ یەکتری دەکرد، لەو ساتانەداو لە هیکڕا شەپە شەپێك لە ئاسمانەوە ڕایچڵەکاندین. هەرسەرمان بەرزکردەوەو منو دڵشادو نەبەز بە هەڵەداوان پەلاماری چەکەکانماندا کە لە تەنیشتمان بە بنەدارێکمانەوە

هەڵپەساردبوون، بەڵام نەبەز لە ئێمە تەردەست تربوو، بۆیە تابلێی یەکو دوو بە تەقەی تفەنگە ناتۆیەکەی برادەرانی تری بێدارکردەوە.
ئای! لەو دۆڵە چۆڵو هۆڵەو لەناو ئەو بەفرو بێدەنگییەدا ئەو تەقەیە چ دەنگێکی دایەوەو ئاوازی دەنگو زایەڵەکەی زرمەیەکی چەند خۆشی لە گوێماندا زرینگاندەوە!. من هەرگیز جارێکی تر گوێم لە تەقەیەکی وەك ئەو تەقە ئومێد بەخشە خۆشو پڕ لە ئاوازە نەبوویەوە. تەقەکە دڵو گوێی کردنەوەو تەمی بێ ئومێدی لە پێش چاوان ڕاماڵیو مزدەی خۆشییەکی چاوەڕوان نەکراوی گەیاند. ئەو تەقەیە پەیوەندی بە هزر، گوێ، دڵو گەدەوە هەبوو!.. کە سەیرمکرد دەمدی لە شوێنی سێرەی کڵاوشینکۆفەکەم شتێك دەهاتە خوارێ بۆ ئێمە لە هەموو شتەکان پێویست تر بوو... ئەو شتە باڵندەیەکی ڕەشی زەبەلاح بوو..!.
نەبەز پێکایو لەسەر سەری پیرەدار بەڕووەکەی هێنایە خوارەوە. سەیر لەوەبوو هەر کە شەپە شەپەکەی بە ئاگای هێنایەوەو ئێمەش پەلاماری چەکەکانماندا باڵندەکەش کە لەسەر لکە دارێکی وشکی سەر سەرمان نیشتبۆوەو هەستی بە جووڵەی ئێمە کرد ،لەو ساتەیدا کەویستی بفڕێتەوەو خۆی دەرباز بکات، بۆ فڕینەوە فشارێکی خستە سەر لکە دارەکەی ژێریو لکە دارەکەش بەرگەی نەگرتو کتوپڕ شکاو چەند چرکەیەکی لە هەستانەوە دواخست..
ئەو چەند چرکە دواخستنە بۆ باڵندەکە بووە مایەی سەر تیاچوونو بۆ ئێمەش ئارمانج پێکانو دەربازبوون بوو لەسەرتیاچوون!؟.
ئەو کاتەی بە چاوەکانی خۆشم دەمدی باڵندەکە لە ئاسمانەوە دەکەوتە خوارەوە، بەڵام لە خۆشییان دڵم بڕوایی نەدەهات!..

چاوم تێبڕیبوو، هات تەپ.. تەپ کەوتە بن پێیان‌و بەردەستان.. دڵشاد چەقۆکەی دەرهێناو گەرماو گەرم سەری بڕی‌و یەکسەر خۆشییەك دڵی هەموانی گرتەوەو بۆ یادگاریش من کامێراکەم دەرهێناو چەند وێنەیەکی باڵندەکەم گرت. دەشتی لە هەموومان کەڵەگەتتربوو، کاتێك سەری باڵێکی خستە ژێر پێی‌و سەری باڵەکەی تری بەرزکردەوە لە بەرزایی دەستیشی زیاتر بوو!. ئەجات کەکوڕێکی بچکۆلە بوو دەیگووت: ئەم باڵندەیە بەقەد من دەبێت.

* * * * *

پێشمەرگەو دیل بەیەکەوە دەورمان داو کەوڵمانکرد. گۆشتەکەمان کردە دوازدە بەش، بە بۆچوونی هەموان باڵندەکە شەش کیلۆ زیاتر دەبوو. هەریەکەمان بەشە گۆشتەکەی خۆمان بە شیشێکەوە برژاندو هەنگی جاشەکان دەیانگوت:

—ئێمە سەرەتا پێمان وابوو بەشی ئێمەی لێنادەن!.

بەڵام، کە دیتیان بە یەکسانی دابەشمان کرد هێندەی تر شەرمەزاربوون. بەو برسێتییە شیشەیەك گۆشتی بە خوێ! بەڵێ لەو ڕەوشە ناڵەبارەدا شیشەیەك گۆشتی برژاوو بە خوێ نەك هەر کەم نەبوو، بەڵکو لە چارەنووسێکی ڕەشی ڕزگارکردین؟

ئەو باڵندە پیرۆزە لە کوێوە هات؟!. ئەوە خوا ناردی! خدری زیندەبوو! لەبەر ئەوەی مارکسیست بووین خۆ ئەگەر یەکێکیشمان باوەڕی بەوە هەبووبێ کە پەیدا بوونی باڵندەکە کارێکی خوایی بووەو بۆ ئەوەی نەمرین بۆی ناردووین ئەوا هەر بڕوای ناخی خۆی ئاشکرا نەدەکردو بە ڕووداوێکی (ڕێکەوت)ی دەردەبڕی!.. خۆ ئەگەر لە خواووەوەش نەبووبێ ئەوا بێگومان بەهۆی ئەو هەموو بەفرە بارییوە باڵندەکەش لەو کوێستانانە وەکو

ئێمە سەرگەردان‌و برسی‌بووەو لە پێناوی نێچیرێك دەسووڕایەوەو کاتێکیش لە ئاسمانی بە تەمتومانەوە چاوی بە ئێمەی سەر بەفرو ناو بەفر کەوت ڕەنگە بە کەلاك، یان ئاژەڵمان تێگەیشتبێ ، بۆیە بە گوڕ دابەزی‌و کاتێکیش ڕووبەڕووی ئێمەی لە خۆی برسی ترو بە تواناتر بووەوە خۆی بووە نێچیرو قوربانی دەرباز بوونی ئێمە؟ ئەوەش یاسای دارستان‌و ژیانەو هەمیشەو هەر بەهێزترین سەردەکەوێ وەهەر ئەویش دەمێنێتەوە !

هەنگینێ شتێکم هاتەوە بیرو ڕووم لە مام جەوهەر کردو پێم گوت:

– مام جەوهەر پێدەچێ ئێمەش گورگە کوڕەکە بین؟

مام جەوهەریش کە فەرماندەیەکی سوعبەتچی بوو، یەکسەر گوتی:

–ئەگەر ئەو نەباین ئەو باڵندەیەمان لێڕاست نەدەهات‌و نەدەهاتە بەردەست!.

سێ ڕۆژ پێش ئەو سەفەرەمان لەگەڵ مام جەوهەر لە نزیك گوندی خەتیبیانی دەشتی هەریر چووینە ماڵێك بە تاقی تەنیا لەوێ دەژیان‌و کە لە کابری خاوەن ماڵمان پرسی: باشە ئێوە بە تەنیا چۆن لێرە دەژین خۆ دوژمن ئەم ناوەی ڕاگوازتووەو ڕێگەش نادات خواردەمەنی‌و کەسیش بۆ ئێرە بێ؟..

کابرا بە پشوویەکی درێژو کەسەرەوە گوتی:

–خوا تا ئەجەلمان نەدات نامرین‌و تا سەریش بمێنێ ڕزقی دەدات.

بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەشی ئەم حیکایەتەی گێڕایەوەو گوتی:

–دەڵێن ڕۆژێك بزنێك لە ناو مێگەلی شوانێك هەرەتە دەبێ‌و دەڕواو بەڕاکردن لە مێگەلەکە دوور دەکوێتەوە، هەرچەندە شوانەکە بانگی دەکات‌و بە دوایدا ڕادەکات کەڵکی نابێ ، تا لە جێگایەك

بزنەکە دەچێتە ناو ئەشکەوتێکو کاتێکیش شوانەکە دەگاتە سەری دەبینێ گورگێکی گورە سەری لە کەلاکی بزنە بۆرە ناوەو دەیخوات!.. ئەوجا خوا چۆن رزقی ئێمە دەبڕێ؟.
لەوێ، لەگەڵ مام جەوهەر باسی ئەو حیکایەتە ئەفسانەییەمان کردەوەو بە دڵنیاییشەوە ئەگەر ئەو باڵندە نەبووایە لانی کەم چەند هەڤاڵێکو دیلەکانیش نەیان دەتوانی زیاتر رێبکەونو لەوێ بەجێ دەمانو دەمردن!..

* * * * *

تۆزێك گوڕو تینمان هاتەوە بەرو بەرە بەری رۆژئاوا کەوتینەوە رێ. تا زیاتر دەرۆیشتین بەفریش بەرەو کەم بوونەوە دەچوو، لێرەش بەولاوە شارەزا بووینو دەمانزانی ناو گەلی بێخمەو دەوروبەری بە هۆی زێی بادینانەوە کەمتر بەفر دەگرێتەوە . کاتێك گەیشتینە کاولە گوندی ڕاگوێزراوی مێرگەمێر هەندێك لە برادەران لە پەلوپۆ کەوتبوون. دەی برادەرینە، دەی چاوەکەم... کەڵکی نەبوو. خەو چاوی کوێر کردبووینو بەرپێی خۆمان نەدەدیو برسێتیش توانای رۆیشتنی کوشتبوو. جاری وا هەبوو چەند هەنگاوێك بەدەم خەوەوە دەرۆیشتینو هەندێ لە هەڤالانو سێ دیلەکەش زوو زوو دەکەوتنو هەڵدەستانەوەو زۆر بە زەحمەتیش هەنگاویان دەنان. قاچی چەند هەڤاڵێك پەنماو بە تەواوی شەکەت بوون، بەڵام هەردەبوو برۆین. کاکلی دیل هاواری دەکرد:
بەجێم بێڵن یا من لێرە بمرم..
فکری (دیل) دەیگوت:
– بمکوژن باشترە ...

عومەر(دیل)یش لەوان پەرێشان تر بوو . دیارە ئێمە لە ڕوانگەی مرۆڤایەتیەوە بە جێمان نەدەهێشتن دەنا هیچ کارێکمان پێیان نەمابوو. هەر بۆ هاندانو بۆ ئەوەی بڕۆنو بەتەواوی نەکەون، ئەوانەی وەزعمان باشتر بوو درۆمان بۆ ئەوانە دەکردن کە شەپرێوو شپرزەبوون.

تۆ وەرە سەیرکە بەو وەزعەشەوە دەچووین بە خۆشی بێ، یان ناخۆشی خواردن لە دوژمن بسێنین! . کاتێك لە دوا تەکانو کۆتایی توانای هەنگاونانو لە ڕۆخی مردندا گەیشتینە ڕۆخی گوندی سوسێ سەرمان لەو تروسکە ئاگرانە سوڕما کە لە ناو گوندەکەدا بەرچاو کەوتن. زووتر هاتوچۆی ئەو گوندەمان کردبوو، بەڵام پاییزی هەمان ساڵ هەواڵمان بۆ هات کە خەڵکەکەی ڕاگوازرانو چۆڵکرا، ئێستاکەش کە دەبینین گوندەکە ئاوەدانە!

لە خۆمان دەپرسیەوە:

—ئەوە ئاوەدان کراوەتەوە یان، هێزی دوژمنی لێیە؟!

* * * * *

هەرچی بێ ! ئەوانەی لە پەلوپۆ کەوتبوون بەجێمانو ئەوانەی تریش بە پارێزە پارێز خۆمان گەیاندە بەردەم یەکەم خانووی گوندەکەو لەوێ تێگەیشتین ئاوەدانە. تا بێ ئارێشە خۆمان بگەیەنینە ئەو ماڵە پلانێکمان داڕشتو بەپێی ئەو پلانە سالارو نەبەز بەخشکەیی خۆیان گەیاندە پشتی دەرگای ماڵەکەو بۆ ئەوەش سەر لە خاوەن ماڵەکە تێك بدەینو بێتە دەرەوەش لە دوورەوە هاواری ماڵەکەمانکرد. کاتێك لە دوورەوە گوێیان لە دەنگمان بو خاوەن ماڵەکە بە چەکێکی ئار. بی. کەی بەدەست دەرگای کردەوەو ئەو سێرەی لەلای ئێمە گرتبوو، بەڵام هەڤاڵانی

پشتی دەرگا لوولەی تفەنگەکانیان دانایە سەر پشت. کابرا بە ترس و لەرزەوە یەکسەر گوتی:
–ئێمە بە ناچاری چەکمان هەڵگرتووەو دژی ئێوەنین.
ئێمەش چووینە ئەو ماڵەو هەر چەندە بە ڕاستی قسەمان بۆ کابرا دەکردو دەمانگوت:
– لێقەوماوینو نەهاتووین ئێوە چەك بکەین، بەڵام کابرا بڕوای نەدەکردو دەیگوت:
–دەزانین ئەمشەو شەوی گورگانەو خۆشمان دەمانزانی ڕۆژێك هەر تووش دەبین ، بەڵام چی بکەین بە مەرجی چەك هەڵگرتن بۆ پاراستنی پرۆژەی بێخمە حکومەت ڕێگای مانەوەی داوین، دەنا ڕاماندەگوازنو گوندەکەشمان وەکو گوندەکانی تر وێران دەکەن..
کابرامان لەگەڵ خۆمان بردە ماڵی مام سلێمانی ڕیش سپی گوندەکەو لای ئەویش ڕاستی مەسەلەکەمان باس کرد، بەڵام هەم ئەوو هەم خەڵکەکەش هەر بڕوایان نەدەکردو پێیان وابوو دارو بەردی ئەو ناوە بۆتە پێشمەرگە !.
ئەوانەی کە لە دەرەوەی گوندیش کەوتبوون هاتنو مام سلێمان دابەشیکردینە سەر ماڵان، بەڵام جگە لەمام سلێمانو ژنو منداڵ، پیاوە جاشەکانیتر هەموویان خۆیان شاردەوەو ئەوەش بۆ ئێمە گرینگ نەبوو، چونکە هیچ کارێکمان بەوان نەبوو! ... وا ڕێککەوتین بە پەلە نانێك بخۆینو پشوویەك بدەینو بڕۆین. هەرچەندیشە پیاوەکان لە ماڵ نەمان، بەڵام ژنەکان خزمەتێکی زۆریانکردینو ئەرکی میوانداریان بە جوانی بەجێهێنا.
کە بەسەرهاتەکەشمان بۆ مام سلێمان گێڕایەوە ئەو دەیگوت:
–ئەنگۆ عێفریتن، جندۆکەن، شەیتانن چن هەی مار پە میراتینە؟!

هەروەها دەیگوت:

–بەو چلەی زستانە مەگەر دێوەکان بتوانن لەو چیا سەختە بدەنو ڕزگاریان بێ، دەنا ئەوەی ئێوە کردووتانە مرۆڤ کردەنی نییە!. هەروەها درێژەی پێدەداو دەیگوت: پە شێخ ئەحمەد ئەمن شێست ساڵ زیاترم نەمزانیوە لەم کاتەی ساڵدا کەسێك لە کورێس، یان بێراتی دابێو دەرباز بووبی، بەڵام چەندین کەسم دیون لەو چیایەدا لە بەفردا خنکاون‌و ڕەق بوونەتەوە. بۆیە ئێوە یان دێون، یان فریشتەن، یان... کە مام سلێمان بەو شێوەیە باسی سەختی‌و دژواری ئەو چیایەی لە چلەی زستان بۆ دەکردین ترسی پاشوەخت موچڕکی بە گیانماندا دەهێنان.

*    *    *    *    *

من وچالاك وفیکری میوانی مالێك بووین تەنیا ژنێکی بەرێز ڕووخۆش ومناڵە ووردەکانی لەوێ بوون . دوای نان خواردن لەبەر سۆبەی گەرمی داران هێندە خاوبووینەوە یەکسەر خەومان لێ بکەوێ ، بەڵام نەدەکرا چونکە ماوەی دیاری کراو زۆر کەم بوو.لەگەڵ چالاك بڕیارماندا هەریەکەو چارەگە سەعاتێك بەنۆرە بخەوین .سەرەتا ئەو نوست هەر سەری نایە سەربالیف خەوکوتکە بردیەوەو بەناو خەوێکی قووڵ وتامەزرۆدا ڕۆچو. کاتی دیاریکراو بانگم کردوهۆشیارم کردوەو خۆشم هەر لەبەر سۆبەکە چاوم نانە سەر یەکتری یەکسەر نووستم. لەبەر ئەوەی بە هەستیاری نووستبووم ، هەر دوای چەند خولەکێك بە ئاگا هاتمەوەو سەیرمکرد چالاك دیسان خەوتۆتەوە!... هەرکە فکری زانی کە پێم ناخۆشە ئەو خەوتۆتەوە پێی گوتم:

تۆش بنوو غەمت نەبێ من بە ئاگام!.

پێکەنینم بەو قسەیەی دیلەکە دەهاتەوە، بەڵام ئەو لە ناخیەوە ئەوەی گوت، چونکە لەو سەفەرەدا هەم باش تێکەڵ ببووین و هەم ئەگەر نیازێکی خراپیشی هەبوایە ئەوا لەبەر پەرێشانی وەزعی خۆی هەر هیچی پێنەدەکرا، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵوێستەکەی هەر جێگەی سوپاس بوو!

مام سلێمان ئامادەیی خۆی پیشاندا کە وەك شارەزاو رێنوێن لەگەڵمان بێت. کاتێکیش کە بەرێ کەتینەوە باران بە لێزمە دەباری و تەمتومانیش شەوەکەی هێندەی تر تاریك و ئەنگوستە چاو کردبوو. دوژمن ناو گەلی بێخمەو لێوارەکانی زێی زۆر باش قایمکردبوون، لەبەر ئەوە مام سلێمان دەیگوت:

– هەرچەندە من خەڵکی ئێرەم، بەڵام بە تەنیاش ناتوانم بە ناو ئەو هەموو مۆڵگانەی حکومەتدا ڕەت ببم، نەخاسمە ئێوەشم لەگەڵدا بن و بەخوا بڕینی چیای پێرسیش دوای ئەو هەموو بەفر بارینە کارێکی مەحاڵە.

–باشە چار چییە؟

–چار هەر ئەوەیە من بەرێگایەکی زۆر ناخۆشتاندا دەبەم و دەبێ ئێوەش وریابن و پشووشتان درێژبێ.

–باشە خۆت چی بە چاك دەزانی ئێمە قایلین.

* * * * *

مام سلێمان پێشکەوت و ئێمەش بەدوایدا بە تەلانی نێوان چیاو زێدا هەڵگەڕاین و لە نێوان بەفرو دوژمن بە بزنە ڕێیاندا سەردەکەوتین و دەڕۆیشتین. لەبەر تاریکی و سەختی ڕێگا دەستمان بە پشتی یەکتریەوە گرتبوو، لە هەندێ جێگادا لە تەلان و ڕەوەزی زۆر سەختدا سەردەکەوتین و دەبو بە دەست ڕاکێشان و دەربازکردنی یەکتری سەربکەوین و هەڵبگەڕێین. لەو

تەلانە سەختەدا هەر دەكەوتين‌و هەڵدەستاينەوە، لە نێوان تريكە شاخ‌و سەر ئەو بەردە ڕەقانەش لەبەر بەربوونەوە گيانمان هەموو كوتراو مام سلێمانيش زوو زوو دەيگوت:

– كەس نەكۆخێ (بيگەيەنە)، كەس دەنگ نەكات (بيگەيەنە)، بەردى ژێر پێتان غلۆر نەبنەوە (بيگەيەنە)، چونكە دوژمن لە خوار ئێمەيەو هەر هەستمان پێبكات كارمان تەواوە (بيگەيەنە).

لە خوارەوە هاژەى زێ دهات‌و لە سەرەوەش هاشەى باران ،ئێمەش بێدەنگ هەڵدەگەراين‌و دەكەوتين‌و هەڵدەستاينەوە، مام سلێمان زۆر شارەزابوو، دەنا كەس بەر پێى خۆشى نەدەدى. ئەو لە پێشەوە دەڕۆيشت‌و ئێمەش يەك لەدواى يەك پشتى يەكتريمان گرتبوو. شوێنەكە زۆر سەخت بوو، ئەگەر يەكتريمان نەگرتباو يەكێك غلۆر بووبايەوە ئەوا بێگومان بە هەڕوون هەڕوون كراوى دەكەوتە بەر دەستى دوژمنان.

سەرەڕاى تاريكى‌و سەختى ڕێگاكەش بەهۆى شارەزاكەمان ئەمجارە بێفەم تر لە دەروونيشەوە زاڵتر بووين. بەرەبەيان لە دۆڵى بياوێ‌و بەرامبەر گوندى سۆران، لە تەلانەكە بەرەو كەنار زێ شۆڕبووينەوەو ئيدى لێرە دواى سوپاسكردنى مام سلێمان ئەو بەرەو گوندەكەى خۆى گەڕايەوەو ئێمەش لە بنارى پێرس بەرەو بارەگاكانمان درێژەمان بە ڕۆيشتندا.

* * * * *

لەوبەرى زێ لە شوێنەوارى گوندى سۆران قەرەباڵغييەكى زۆرى سوپاو جاش دياريبوو. لەو كاتەدا من نوشتە نامەيەكى برادەرێكى ڕێكخستنم هاتەوە يادو كاتێك لە ناو كوڵە پشتەكەم هێنايە دەرێ‌و خوێندمەوە تيايدا نووسرابوو (... ئێمە فەوجى (٦ )ى سووك ڕۆژى ٨٨/١/٢٥ بەدل دەبين‌و سۆران بەجێ دێڵين بۆ

ئاگاداریتان. هەڤاڵتان ڕێبان) بە خوێندنەوەی ڕاپۆرتەکەش ئەو قەرەباڵغییەم بە ئاڵوگۆڕی هێزەکانی دوژمن لێکدایەوە.
لەگەڵ هێزەکەی دوژمن ئەمبەرو ئەوبەری نزێ بووین ، پێم وابێ لەبەر ئەوەی لەلای دوژمنەوە دەچووین سەرەتا ئەو هێزە پێی وانەبوو پێشمەرگە بین ، بەڵام هەر کە پشتمان کەوتە ئەوان ئێمەیان دایە بەر دەستڕێژی گوللە، بەڵام ئێمە گوێمان پێ نەدانو هەر درێژەمان بە ڕۆیشتنی خۆماندا تا لەناو جەنگەڵو دۆڵو نشێوەکانی بناری پێرس خۆمان بزرکردو لە مەترسییەکان دەرچووین.

* * * * *

ئەسپی گۆڕینو حیکایەتی کابرا ئەو سەربردەی هێنامەوە یادو کابراش هێشتا هەر بەردەوام بووو منیش ئەو بیرەوەرییانم بە خێرایی تیشکی خۆر بە بەرچاودا ڕەت دەبوونو کاتێکیش لە خاوەن ماڵەکەم پرسی باشە کابرا نەیگوت ئەو پێشمەرگانە کێ بوونو چیان بەسەر هات؟
ئەو گوتی : با، دەیگوت:
ئەوانە پێشمەرگەی نەشارەزابوونو زریانو بەفر لێی گۆڕیبوونو لەناو لاتو ڕازە شاخو هەڵدێرەکانی بێرراتو کۆڕیس ڕەق بونەتەوە، بەڵام تا ئێستا تەرمەکانیان نەدۆزراونەتەوە. ئەو هەژارو بەلەنگازانە بێکەس بوونو ئەمڕۆش لەم ڕۆژگارەدا کێ دەتوانێ غەمی کێ هەڵبگرێو کێ بەری ئەوەی ماوە بەدوای زیندواندا بچێ نەخاسمە مردوان...!.
خانە خوێکەم لەسەر زاری فرۆشیاری ئەسپەکەی بە کەسەرو ئاخەوە بەسەرهاتی پۆلە پێشمەرگەکەی دەگێڕایەوە، بەڵام من لە کۆتاییدا پێم گوت:

—ئەو پێشمەرگانەی تۆ باسیان دەکەی هەموویان دەربازبوون و ماون ، برا !...

ئەو بەحەپەساویەوە سەیرێکی منی کردو گوتی:

—تە چاوا دزانی..؟!

—ئاخر ئەزیش یەکێك بووم لەوان ، بەڵام مەترسە ئەسپەکە هەر هی خۆتە!.

کابرا هێندەیتر واقی ورماو لەسەرەخۆ گوتی:

—بێژە ب خووودێێ!



تێبینی : ئەم دەقە لە ژمارە ٣١ی گۆڤاری ئایندەدا بڵاوکراوەتەوە

# ڕێگای شەوو هەواری ڕۆژ

لە چلەی هاویندا، لەسەر لوتکەیەکی هەرە بڵندی چیای قەندیل ڕووەو کوردستانی باشور دابنیشەو دووربینێکی تایبەت بدە پێش چاوان و، ورد ورد تەماشا بکەو ڕابمێنە .. نیشتمانێکی ئاوەدان‌و پڕ لە جووڵانەوەی ژیان ، هەر لە جووت‌و جووتکاری‌و هاتن‌و چوون‌و شین‌و شایەوە ..... تا دەگاتە سەر مەڕو مەڕداری‌و تێکقژقژانی باڵندەو دەعبا کێویەکانیش ، ئینجا لە هەمان شوێن‌و کت‌و پڕ فیلمەکە بگۆڕەو هەمان نیشتمان بە سووتاوی‌و خاپوورکراوی و ، ڕاگوازراوی خەڵکەکەی‌و ، چۆڵ‌و هۆڵ بێنە بەر چاوان‌و یەکسەر بەراوردێك لە نێوان هەردوو دیمەنەکەدا بکەو بۆ زانینی چارەنووسی ئەو هەموو خەڵکەش هەزارو یەك پرسیاری بێ وەڵام لە مێشکتدا چاپ بکە .. ئەو کات ، ڕەنگە تەنیا بە دیتنی جموجۆڵی سوپایەکی داگیرکەری بەهێزو بەقودرەت هاوکێشەکەت لا سانا ببێ وجیاوازی‌و مانای هەردوو تابلۆکەت بۆ ڕوون ببێتەوە .

ئا لەو بەرزیەوە دووربینەکەم دەخەمەوە کیفەکەی‌و هەڵدەستم لەگەڵ هەڤاڵەکانم خۆمان ئامادە دەکەین تا لە نێو هەورازو نشێوو ، دەشت‌و دۆڵەکانی تابلۆی دووەمدا گەشتێك لە نیشتمانی وێران‌و سووتاودا بکەین‌و بە چاوەکانی خۆمان بەشێکی ئاسەوارەکانی تراژیدیای ئەنفالەکان‌و کیمیابارانکردن ببینینەوەو بەشێکیش لە ئەرکی سەر شانمان بەرامبەر بە گەلی ستەم لێکراوو نیشتمانی خاپور کراوی خۆمان جێبەجێ بکەین.

ئەو ڕۆژگارە ، هەواری شێخ ئایش جمەی دەهات ، قاچاغچیە توندو تۆڵەکان بەردەوام دەهاتن‌و دەچوون ، لە هاتنیان جۆرە کەلوپەلێکیان دەهێناو لە گەڕانەوەشیاندا جۆرێکی تریان دەبردەوە . هەندێ لەو قاچاغچیانە جاش‌و تیاشیاندا هەبوو پێشمەرگە بوون . ئەو پێشمەرگانە دوای ئەنفال و کیمیابارانکردنی کوردستان بە ناچاری بە ماڵ‌و منداڵەوە ئاوارەی ئێران بوو بوون‌و بۆ بژێوی خێزانەکانیان بە ناچاری پەنایان بۆ بەر ئەو کارە ترسناکە برد بوو ، بەڵام جاشە قاچاغچیەکان دوو سەرە بوون ، لەبەر ئەوەی ئەوانیش لە ناچاری چەکیان هەڵگرتبوو بوو، بێگومان لە ناخەوە دژی ڕژێم بوون . لە هەمان شوێندا هێزێکی پێشمەرگەش ئامادە بوو، ئەو هێزە ئەرکی گومرگ کردنی بارەکان‌و پاراستنی شاخەکە بوو . بەم ڕەنگە لەو شوێنەی لە چلەی هاویندا هێشتا مەندیلی هەر فرێ نەدا بوو بازاڕێکی وەرزیی ئاوا کرابووەوە .

* * * * *

شەوی ١٢/١١ —٧ لەو ئاواییە قاچاغەدا من لە چادرەکەی کاك عەزەی داودی(*) نووستم ، بەڵام بەرەبەیان لە لای گۆمی کرمە سورانەوە دەنگی چەند تەقەیەك هات، زۆری نەبرد هەواڵیش هات کە ڕژێم لە وێوە بەرەو قەندیل هەڵکشاوەو مەبەستی پەلاماردانی ئەو ناوەی هەیە . غەڵبە غەڵب پەیدا بوو، منیش وەکو پێشمەرگەو قاچاغچیەکان بە پەلەپەل خۆم

---

* پێشمەرگەیەکی سەرەتای شۆڕشی نوێ‌و فەرماندەیەکی ئازا بوو ، دوای ڕاپەرین بە ڕووداوێك شەهید بوو .

بەستەوەو هەر لە دەرگای چادرەکە چوومە دەرەوەو کاك عەزەی داودی قۆڵی گرتم‌و گوتی:

-جاری کارتۆنێك پاکەتم بۆ لەو باسکە ئاودیو بکە ئنجا دەچینە شوێنی پێویست !

لەو کاتەدا نەمتوانی هیچ وەڵامێکی بدەمەوە ، بۆیە ڕەق ڕاوەستام‌و ئەویش بۆ خۆشیی گوتی :

-بۆچی ڕاوەستاوی ؟ برام ، ئەگەر ئەو کارتۆن پاکەتانەم بگیرێن، یان بسووتێن پێمان وەرناگیرێنەوەو لە دەستم دەچن ؛ بەڵام ئەگەر هەر لوتکەیەك بگیرێ دەتوانین زوو وەری بگرینەوە !.

لەگەڵ ئەم قسانەیدا داواکەیم جێبەجێ کرد، ئینجا لەگەڵ هەڤاڵان چووینە چەقەرێکی بەرامبەر بە گۆمی کرمە سوران ،کەچی ڕۆژ بووەوەو دوژمنیش هەر نەهاتە پێش ، بەڵکو هەر لە نێوان چیای کونەکۆترو گۆمی کرمە سورانەوە مایەوەو لێی داکوتا.

ئەو ڕۆژە بە پرسیار کردن‌و وەرگرتنی زانیاری ؛ ئەو ڕێگەیەمان دەست نیشان کرد کە دەبوو پێیدا بڕۆین‌و ئەو هێڵە نۆزەخیەی دوژمن ببەزێنین کە وەهای قایم کردبوو لای خۆی چۆلەکەش نەیدەتوانی لێی بپەڕێتەوە .

* * * * *

دوای نیوەڕۆ ئێمە نۆ پێشمەرگە لەگەڵ دەستەیەکی قاچاغچییان ڕێککەوتین کە بەیەکەوە بڕۆین، چونکە ئەوان شارەزا بوون‌و بەردەوام لە هاتوو چۆ کردندا بوون . سەر قەندیل‌و سەر قەندیل لە شێخ ئایشەوە بە ڕێکەوتین‌و بە هەوارەکانی خرەندۆڵ‌و سەوەدا ڕەتبووین‌و لە مێرگێکی پڕ لە کەویە بەفرو کەسکایی بنکەو بارەگای هێزێکی(حزبی دیموکراتی کوردستانی

ئێران ) مان کەوتە سەر ڕێ ، ئەو هێزە زۆر سەرنجی ڕاکێشاین . پێشمەرگەکانی ئەو هێزەش بە پێچەوانەی ئێمە ڕوویان لەو دیو واتە ڕۆژهەڵات بوو. لەو کوێستانە بەرزە بە نێو دۆڵو مێرگو سەر لوتکەو هەورازو نشێوانەدا دەڕۆیشتینو هەندێ جار لەناو کوردستانی ئێرانو هەندێ جاریش لەناوکوردستانی عێراق دەڕۆیشتینو جارجارەش هەردوو کوردستانمان لێ دیار دەبوونو هەرگیزیش هیچ هێمایەك یان ، نیشانەیەکی سروشتیی ئەو سنوورە دەستکردەمان نەدەدی .



ئێوارە پێش ڕۆژئاوا بوون گەیشتینە بەرزایی سەر گۆڕتێسو. کە دەبوو لەوێ (لە قەندیلەوە) بەرەو باشوور یاخود ، باشترە بڵێم بەرەو قووڵایی کوردستانی عێراق شۆڕببینەوە ،بەڵام لەبەر ئەوەی ڕۆژ بوو هەرچۆنێ شۆڕ بووبایینەوە لەلایەن هێزەکانی دوژمنەوە دەبیندراین وئەو کاتیش ئاشکرا دەبووین ، بۆیە دەبوو تا ڕۆژئاوا لەو شوێنە خۆمان گیر بکەینو لە چاوەڕوانی ماڵئاوایی خۆردا ڕووەو خۆرئاوا ڕوبنیشینو پشوویەك بدەین . بەڵام ، هەرکە هەناسەیەکی پشوودانماندا و خاو بووینەوە، ئارەقەی ڕێگاش سارد بووەوەو لە هەمان کاتیشدا یەك بای زۆر ساردی دەهات ، سەرما بە تەواوی تینی بۆ هێناین ولە سەرما خۆمان دابووە پاڵ ئەو شوێنانەی کەمتر بای دەگرتەوە . لەوێو هەروەها لە ڕێگاش من زۆر سەرنجی قاچاغچییەکانم دەداو دەمویست لە خووو ڕەوشتو هەڵسوکەوتیان تێبگەم نەوەك کەسانێکی سەر بە دوژمن بن ،بەڵام لێیان تێنەدەگەیشتمو هەر بە

هۆی سەرو بیچمیشەوە لە دوواتییان بە گومان بووم . ئێمە چاوەڕوان بووینو تا خۆریش نزمتر دەبووەوە سەرماش زیادی دەکرد . وەختێك دیتم یەکێك لە قاچاغچییەکان کونێکی زۆر باشی دۆزیوەتەوە کە با نایگرێتەوەو منیش چوومە لای‌و دیار بوو قاچاغچییەکە زۆر تامەزرۆی پرسیارکردن‌و قسان بوو، منیش بۆ ئەوەی باشتریان بناسم لەگەڵیدا کەوتمە گفتوگۆو لە گەرمەی قساندا هەر بە فۆنەتیك هەستم کرد ئەو کورە خەڵکی لای دۆڵی ئارانێ یە ! بۆیە کە لێم پرسی یەکسەر گوتی:

-خەڵکی گوندی تارینانم ! ئەتۆ کوت زانی ئەمن خەڵکی ئەو ناوچەیەم؟.

منیش پێمگوت :

-لە ئەنجامی قسە کردندا، چونکە خۆشم بە ئەسڵ خەڵکی ئەو ناوچەیەم .

ئیدی قسە بە قسەو پرسیار بە پرسیار بووینە خزم‌و ناسیار!...

بەو یەکتر ناسینە دڵم خۆش بوو،چونکە دڵنیا بوومەوە کە ئەوانیش سەر بە ڕژێم نین . بۆ ئەوەی ئەوانیش دڵنیا بن هەواڵی ئەو یەکتر ناسینەم بە برادەران ڕاگەیاند، هەروەها عەبدۆ تارینیش بەو یەکتر ناسینەوەیە زۆر خۆشحاڵ بوو، ئەویش یەکسەر بە هەمان شێوە ئەو هەواڵەی گەیاندە براو ئامۆزاو هاوڕێکانی تری .

* * * * *

لە دوا جاردا خۆر تەنیا تیشکە سوورەکانی هێشتنەوە، ئەوجا ئەوانیشی کێشانەوەوئێمەش وردە وردە لەناو تاریکایی شەو بۆ ناو نیشتمانی خاپوورو بێ هاونیشتمانیی‌و پڕ لە مەترسی بە ڕێگای مەرگچێن لە پێچەکانی خیزان بەرەو گوڕتیسوی سەر پشتی قەڕناقاو پشت ئاشان شۆڕبووینەوە . نشێوەکە ڕك‌و دوورو

دریــژ بــوو ، بــۆیە باووباپیرانمــان ڕێگاکــەیان بــە شــێوەیەکی ئەندازەیی پێچاو پێچ نەخشاندبوو. کە گەیشتینە گۆڕتیسۆ لە بــناری چــیادا بــەرەو ڕۆژهــەلات دەڕۆیشــتین . نەمــرۆ وەرتــی (قاچاغچی) زۆر شارەزای ڕێگاو ناوچەکە بوو، بۆیە لە پێشی پێشەوە دەڕۆیشت و منیش دووەم و هەندێ جاریش سێیەم کەس لە دوایدا دەڕۆیشتم . شەوێکی زۆر تاریک و ڕێگایەکی تا بڵێی ناخۆش و سەخت بوو . لە ڕاستیدا ئەو شوێنەی کە لێی دەڕۆیشتین هەر ڕێگا نەبوو، چونکە نەدەبوو لە ترسی (مین)ە چێنراوەکانی دوژمن بەسەر ڕێگای دیاردا بڕۆین . شوێنەکە پڕ لە خڕە بەردو تیژە بەردو بەردی گەورەو گچکەو سەدان چاڵی نەدیتەو کەندو کۆسپ بوو، سەرەڕای ئەوانەش بنەگوێنیە دڕکاویەکان تەواوی سەر زەمینەکەیان داپۆشیبوو، لەو شوێنە سەختەو بەو شەوە تاریکە من هەرچەندە دەمکردو دەمکرد نەمدەتوانی بەر پێی خۆم بەدی بکەم ، بەلکو هەر بە هەستەکانم بە دوای دەنگی ڕۆیشتنی نەمرۆدا دەڕۆیشتم و ئەوانی تریش بە هەمان شێوە بە دوای ئێمەدا دەهاتن . یەك دەکەوت، ئەوەی دی هەڵدەستایەوەو ئەوەی تر دەکەوتەوە . کەمێك ئاگام لە کەوتن و هەستانەوەی هەڤاڵان و قاچاغچیەکان بوو، بەلام بە تەواوی هەستم بە ئازاری بەربوونەوەکانی خۆم دەکرد . چەند جارێك کەوتمە ناو گوێنیە دڕکاویەکان وچەند جارێکیش هەر لەسەریان دەمامەوە ، بۆیە قاچ و قولەکانم هەتا زگو سینگو دەستەکانیشم لەتاو ئازاری دڕکەکان ئاگریان لێ هەڵدەستا . هەستم دەکرد هەندێك لە دڕکەکان هەر لە گیانمدا ماونەتەوە ، بەلام دەرفەتی دەرهێنانیان نەبوو ، چونکە دەبوو هەمووومان بە پێی شارەزاکان بڕۆین و دوا نەکەوین . شارەزا، ▪ شارەزا لەو تەلانە سەختەو بەو شەوە

ئەنگوستە چاوە وەك پڵینگ دڕیان بە تاریکیی دەداو ڕێگایان دەبڕی‌و هەر چەند هەنگاوێکیش دەچووینە پێش دەنگی :
—کێی زەلام ؟
—خۆمانین .
—خۆتان کێن ؟
—قاچاغچین!
—وەرن ڕەتبن!
—سوپاس !
دەیسەنگراندینەوە .

ناوە ناوە ڕوو بە ڕووی دەستەیەك چەكدارو وەڵاغدار دەبووینەوەو یەکتریمان دەنگ دەدا . چ ئیمەو چ ئەوانەی ڕوو بە ڕووشمان دەهاتن ئەگەر پێشمەرگە باین یاخود، قاچاغچی هەر دەبوو بڵێین : قاچاغچین ! چونکە قاچاغچییەکان چ لە کن پێشمەرگەو چ لەکن دوژمن سەلامەتتر بوون ! .

من بەدەم ڕێگەوە هەرچەندە بیرم دەکردەوە ئەو شەوە خۆم هەر پێ لە ئەکتەرێکی ناوفیلمێکی سینەمایی ترسناك دەچوو ، بەلام بەلای قاچاغچییەکانەوە شەوێکی ئاسایی کارو کاسبییان بوو . تا گەیشتینە پشتی ئاشقولکە دەیان جار کەوتین‌و هەستاینەوەو دە جاریش زیاتر ڕێبوارمان دەنگ دان‌و دەنگیاندین .. لەو بنارەدا هەڵلایەك بوو هەر مەپرسە ، چ هەللا !

لەوێ پێش ئەوەی شۆڕی ناو شیوەکەی ئاشقولکە ببینەوە سەیری سەعاتمان کرد زۆر درەنگ بوو ، پێویستی بەوە دەکرد هەڵوەستەیەك لەسەر کات بکەین . شارەزاکان بوون بە دوو بەشەوە بەشێکیان دەیانگوت : ئەگەر بڕۆین تا ڕۆژ دەبێتەوە

لەناو دەستی دوژمن دەردەچین‌و بەشەکەی دیکەشیان دەیانگوت : دەرناچین‌و تووش دەبین .

–باشە ئەگەر نەڕۆین چی بکەین ، خۆ ناگەڕێینەوە ؟

–نەخێر، دەبێ تا شەوی داهاتوو خۆمان هەر لێرە تەقەت بکەین!

دوای لێکدانەوەو گفتوگۆیەکی زۆر بڕیار درا تا شەوی دواتر لەو بنارە بمێنینەوە .

لەبەر ئەوەی مۆڵگەکانی دوژمن زۆر نزیك بوون کە قاچاغچییەکان بارەکانیان لە وڵاغەکان کردنەوەو هەر لەوێیان شاردنەوە ئینجا وڵاغەکانیشیان بەرەو شیوەکەی خوارتر بردن ، چونکە ئەوێ لە دوژمن پەنا بوو . خۆشمان بڕیارماندا بە دەم ئەو ڕووبارە بە خوڕەی وەك تاڤگە لە قەندیلەوە بەرەو دۆڵی ئاشقوڵکە هاژەی دەهات‌و دەهاتە خوارەوە هەڵکشێین‌و لە بەرزی تەلانی بەرامبەر بە مۆڵگەکانی دوژمن خۆمان تا شەوی داهاتوو مات بکەین . بۆ پێشهاتەکانیش بەرنامەمان دانا‌و گوتمان : ئەگەر دوژمن هات ئەوا بەرگری دەکەین‌و ئەگەر هێرشەکەش لە توانای ئێمە دەرچوو ئەوا لەسەر چیا یەکتری دەگرینەوە ، بەڵام ئەگەر هیچ ڕووینەدا ئەوا شەوی دواتر دوای ڕۆژئاوا بوون لە هەمان شوێن خڕ دەبینەوەو بەڕێگای خۆماندا دەڕۆین .

–باشە با دوو دوو ، یا سێ سێ بەرەو سەرچاوەی ئاوەکە کێڵ بینەوە .

ئێمە سێ هەڤاڵ بەیەکەوە ڕۆیشتین‌و هەر زوو هەڤاڵێکمان لێ دابڕا کە هەر ئەویش کوڵەپشتەکەی خۆی هێنابوو . سەرەتا بە هەندمان هەڵنەگرت‌و گوتمان هەرچۆنێ بێ دەمان دۆزێتەوە ،بەتایبەت چونکە شوێنی مەبەست زۆر ڕوون‌و ئاشکرا بوو . لە نێو قەدی چیا لەسەر لێواری سوولیە بە خوڕەکە

جێگایەکمان بە چاك زانیو ئێمە دوو هەڤاڵ ؛ (منو موحسین ) لە قۆناغەکەمان پاڵدایەوە، بەڵام چی ! هەر ئەوەتا بەو بەرەبەیانە بە دانیشتن وزەی ڕۆیشتنمان لە کار کەوتو یەکسەر سەرما هێرشی هێنا ؛ ئیدی تا ڕۆژ هەڵاتو چەند گوریسێکیش لە ئاسمان بەرز بووەوە لەسەرمان هەر هەڵدەلەرزین .

* * * * *

کە ڕۆژ بووەوە ویستمان بە دوای هەڤاڵەکەماندا بگەڕێین نەك لەبەر ئەوەی شتێکی بەسەر هاتبێ چونکە هیچ ڕووینەدابوو، ئەوێش جێی ترسێکی نادیار نەبوو ، بەڵکو لەبەرخاتری کوڵەپشتەکەی کە خواردنی تێدابوو . تۆزێك دەوروبەرمان گەڕاین ؛ نەمان دۆزیەوە ، بەڵام کە سەیری خوارەوەشمان کرد هەم دوژمن نزیك بوو ، هەمیش زۆر ڕووبەڕوو بووین ، بۆیە بە گچکەترین جووڵە لە گوین بوو ئاشکرابین . ناچار، بێ نانو خواردن لە ژێر بەردێکی گەورەو لەبەر ڕشێنەی پریشکەکانی ئاودا پاڵکەوتینو نووستین، بەڵام ئەو کات نەسەرماو نەگەرماش کاریان نەدەکرد ، بەڵکو هەوایەکی هێندە سازگارو فێنکی هەبوو کە دڵ هەمیشە بە مرازی بخوازێ .

ئەو ڕۆژە پشتمان لە قەندیلو ڕوومان لە دوژمن بوو، لە کەشێکی هێمندا بێ دەنگ پشوومانداو تا ئێوارە بە ئارەزووی خۆمان نووستین ، گەرچی منو هەڤاڵەکەم بە برسێتیماینەوە ،بەڵام ئاشکرا نەبوونیشمان برسێتی لەبیر بردینەوە . خۆر ئاوابوو، سیرەی تفەنگ هەڵگیراو ئێمەش لە ژێر تاوێرە بەردەکانی سەر ڕوبارەکە هاتینە دەرەوەو بەرەو شوێنی دیاریکراو شۆڕ بووینەوە .

* * * * *

لە گۆشەیەکی لاچەپی گۆرتیسۆ هەموومان خڕ بووینەوە . تا قاچاغچیەکان بارەکانیان لێنانەوە ئێمەش خۆمان لە برسێتی ڕزگار کردو کۆڵەپشتەکانمان هەڵگرتنەوەو کەوتینەوە ڕێ . جێی هەرە مەترسیدارو ترسناک لێرەوە دەستی پێدەکرد . دۆڵاو دۆڵ چووینە خوارێ، بەڵام هەرکە گەیشتینەوە سەر ڕووبارەکەو ژێر لێرەوارە چڕەکەی شیوی ئاشقولکە دنیا هێندە تاریک بوو بۆ ڕۆیشتن خۆزگەمان بە شەوی پێشووتر دەخواست . ڕێگاکەمان بەدەم ئاوەکەدا دەڕۆیشت و بەهۆی تاریکی و دەنگو هاژەی ئاوەکەش هەردوو هەستی بیستن بینینمان لە دەست چوو بوون و بێگومان لە جێگایەکی وەهاشدا ، بۆنی دوژمن ناکرێ ، بۆیە بە وریایی و ئامادەییەوە بۆ هەر کات و ساتێکی ڕووبەڕوو بوونەوە بە خێرایی بەرەو ناو قوولایی خاکی ژێر چەپۆکی دوژمن دەچووین . باشترین هێمای بزر نەکردنی ڕێگا ڕووبارەکەو باشترین ئاماژەی دانەبڕانیش ئەو دەنگانە بوو کە جار جارە بە هۆی بەریەک کەوتنی ناڵی ژێر پێی دەوارەکان و بەردەکانی سەر ڕێگا بە عەستەم دەگەیشتنە بەر گوێ . ئەو شێوە ڕۆیشتنە ئاسایی نەبوو، بەڵکو غارغارێنێکی تەواو بووو هەر دەتگوت لە پێشبڕکێی ڕاکردن داین .

لەناو کاولە گوندی ئاشقولکە سەرەڕای ڕێگا سەختەکە، بیرەوەرییەکان بۆ هەشت ساڵ زووتریان گێڕامەوەو ئەوەم هاتەوە یاد کە جارێکی تر ئەو شوێنەم دیوەو شەوێکی تیا مامەتەوەو .. لێرە لەگەڵ کاک ڕەسوڵ مامەند دانیشتمو ها لێراهێ لای شەهید ملازم تاهیر مامەوە و....... ئەوانەو لە هیکەوە زانیم هاوسەنگی خۆم لە دەستداو هەستم کرد لە هەواوە بەرەو سەر

عارد دەچووەو : تەپ تەپ کەوتم ، نازانم لە ترسی بە جێمان بوو، یاخود هێشتا برینەکانم گەرم بوون ، یەکسەر قیت بوومەوە ،بەڵام بە دامێزراوی ، تفەنگەکەم هەلگرتەوەو لە جاران خاوتر درێژەم بە ڕۆیشتن دا . تومەز بە هەڵە چووبوومە سەر بەردێك کە لای پشتەوەی لە ناو خۆڵو خوار ڕێگاکە بوو ، لای پێشەوەشی هەڵدێرو ڕك بوو ، بۆیە یەکسەر کەوتبووم . گەیشتمەوە ناو کاروانەکە، بەڵام ئازار گیانی دەگوشیمو قاچیکیشم کەمێك لەنگ بوو . جارێکی تر ئەو ڕێگایەم دیبوو، بەڵام نەمدەزانی ئایا بە هۆی داگیرکردنەوە چ گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە ! لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندۆکە شارەزاییەش بۆ حاڵەتی لێقەومانو دەستەو یەخە بوون لەگەڵ دوژمندا بێ سوود نەبوو .

کاتێك لە پردەکەی خوار گوندەکە دەرچووین ڕووبەڕووی کاروانێك بووینەوەو سەرەتا وامانزانی ئەوە خوستی دوژمنە :

–زەلام کێی ؟

–خۆمانین .

–خۆتان کێن ؟

–قاچاغچین.

–کەواتە فەرموون ڕەت بن .

بۆ ئەو دەنگدانو یەکتر ناسینەش دەبوو هەموو جارێك بەخێرایی بروسکە خۆمان بخەینە میلەوە، یان هەرنا دەبوو لەسەر زگ ڕاکشێین . لەوێ شارەزاکەمان کە لە پێشەوە دەڕۆیشت ڕاوەستاو هەموومان خڕ بووینەوە . سەیرمان کرد هەڤاڵ فەرهاد بە هۆی ژەهراوی بوونەوە تەندروستی زۆر خراپەو هەروەها مام هادیو هەڤاڵ محەمەدیش لە پەلوپۆ کەوتبوون . بەڵام لە ڕۆیشتن بترازێ هیچ چارو چارەسەرێکی ترمان نەبوو . ئەوەی باش بوو لە

ناو چۆمەکە دەرچوو بووین‌و ئەو ڕێگایەی ماشێوو بە باشی دیار بوو . بە دەم ڕۆیشتنەوە بە هۆی جیاوازی وزەو تواناوە لە یەکتری دوور کەوتینەوە . قاچاغچیەکان هەروەکو بروسکە دەڕۆیشتن ، بەلآم ئێمەی پێشمەرگە بە هۆی نەشارەزایی و هەروەها نەخۆش بوونی دوو هەڤاڵ‌و میلاك بوونی یەکێکی تر سووکتر ڕێگاکەمان دەبڕی . بۆ ئەوەی لە یەکتری دانەبڕێین ئێمە چەند پێشمەرگەیەك لە نێوانی قاچاغچیەکان‌و هەڤالآنی تردا دەڕۆیشتین. من کە لە ناوەڕاستدا بووم کاتێکم زانی لە نێوان سورەدێ‌و کۆمتان بە تاقی تەنیا ماومەتەوە ، لەو تەلانە هەستم کرد لە دوو ڕیانێکدام .

– ئایا بەرەو ڕۆژئاوا بڕۆم یان بەرەو باشوور ؟!

نەمدەزانی کامە ڕێگەیان بگرمە بەر ! خۆم نەوی کردەوەو ویستم بزانم کامە ڕێگا جێ پێی تازەی پێوە دیارن ؟ هەرچەند ورد بوومەوەو بەراوردم کرد جیاوازیم پێ نەکرا، ناچار ملی ڕێگای باشوورم گرت کە جوانتر دیاربوو، دەڕۆیشتم و بۆ ئەوەی برادەرانی پێش خۆم بەدی بکەم ، سەیری دوورم دەکرد ، بەلآم لە پڕێك گوێم لە دەنگی ئوم کەلسوم بوو ، باشتر هەستی خۆم ڕاگرت بیستم پیاوێکیش گۆرانیەکەی بە دوادا دەلێتەوە . هۆیێکم لە خۆم کردو سەیرم کرد ڕەبایەکی دوژمنم لە پێشە ... بە نەرمۆکەیی‌و بێدەنگ هەنگاو هەنگاو بە ڕێگای خۆمدا گەڕامەوە ، هەرکە گەیشتمەوە دووڕیانەکەو کەسم نەدی ! نەمدەزانی ئەوانەی لە دوامەوە بوون داخوا ڕەت بووینە یان نا !.. تۆزێك ڕاوەستام ، کەس نەهات ، لە دلّی خۆمدا دەمگوت : ئەگەر ڕاوەستم دەترسم ئەوان ڕەت بووبن ! ئەگەریش دەڕۆم دەترسم ئەوانیش دواتر بێن‌و بە نەشارەزایی بچنە ناو ئەو ڕەبایە ! ناچار

هەندێك بەرەو دواوە گەڕامەوەو زانیم ئەوانیش هێشتا لە دواوەن‌و وەزعی هەڤاڵ محەمەدو هەڤاڵ فەرمادیش خراپتر بووەو هەڤاڵ مام هادیش هەر پەکی کەوتبوو . تا لە دووڕیانەکە دەرچووین بەیەکەوە ڕۆیشتین ، ئینجا لە یەکتری دوور کەوتینەوە .
لە شینکی ئەو دیوی کورتەك گەیشتینە سەر جادەی قیرو خۆش بەختانە لەوێش تووشی هیچ کەمین‌و مینێکی دوژمن نەبووین . خێرا خێرا لە جادەکە پەڕینەوە، ئیدی بە تەواوی لە پشتێنە ئەمنی‌یە بەهێزەکەی سنوور دەرچووین . لەوبەر ملی ڕێگامان بۆ سەرچیای زنەرپینەکێو گرتەبەر ، کە سەیرمان کرد هەڤاڵانی تریش چاوەڕێمان دەکەن ، بەڵام قاچاغچیە شارەزاکان ڕۆیشتبوون !..

* * * * *

لەوێ ، هەڤاڵ مام هادی بە تەواوی پەکی کەوت . خۆ لەوبەری جادەکەش هەر بە داکت چاو بابت چا هێنابوومان ، بەڵام ئێستا هیچ شتێك دادی نەدەداو وشی لێ بڕابوو . هەرچەندە هەوڵمان دەدا نە بە هاندان‌و نە بە هەڕەشە نەمان دەتوانی بیجووڵێنین .
ئەو دەیگوت : ئێوە بڕۆن و من بەجێبێڵن !
–باشە دواتر تۆ چی دەکەی ؟
–من تا بەیانی لێرە پشوو دەدەم‌و بەیانیش دەچمە سەر دارێك لەو دارە گەورانەو خۆم لەبەر چاوی دوژمن تەقەت دەکەم ؟
–باشە، ئەدی دواتر ؟
–سبەی شەویش بەدوای ئێوەدا دێم !
–شارەزای ؟
–نەخێر .

–ئەدی چۆن دەێی ؟
–نازانم چۆن ، بەڵام دەزانم لەوە زیاتر ناتوانم برۆم !.
مەڤاڵ فەرهادیش هەرچەندە باکی بە رۆیشتن‌و تاریکی‌و برسێتیش نەبوو ، بەڵام نەخۆشی تینی لێ بڕیبوو ، مەڤاڵ محەمەدیش هەروا تا دەهات وەزعی خراپتر دەبوو !..
ئەی خودایە لەو سەر جادەیەو لەبن دەست‌و پێی دوژمندا چی بکەین باشە ؟
دوای پشوودانێك بە قسەی خۆش‌و ماندان‌و دەی زۆرمان نەماوە و........ دەی ئێرە سەر جادەیەو هەر تۆزێکی تر برۆین ئیسراحەت دەکەین‌و ..... بەو جۆرە قسانە مام هادیمان قیت کردەوەو چەند هەنگاوێك رۆیشت سەیرێکی چیاکەی کردو گوتی :
–ئەمن قەتاو قەت ناتوانم وەسەر ئەم چیایە بکەوم‌و لێم گەرێن با لێرە بمرم باشترە !.
لەو قسانەدا بووین‌و کاروانێك بە دوای ئێمەدا هات‌و سوارێك لە پێشەوەی دەرۆیشت پێمان گوت : ئێمە پێشمەرگەین‌و سێ کەسمان نەخۆشن تکایە هاوکاریمان بکەن‌و دەربازیان بکەن ؟ کابرا گوتی : بەسەرچاو، بەڵام من بۆ شارەزایی لە پێشەوەم و ئێستا وەڵاغی بێ بار بە دواماندا دێن . ئەوان رۆیشتن‌و هیچ وەڵاغێکی بێ بارمان نەدی !.. ئەمجارە کاروانێکی تر هات دیسان سوارێك لە پێشەوە دەرۆیشت‌و هەڤاڵ شەریف پێی گوت: تکایە ئەو سێ پێشمەرگە نەخۆشانەمان هەڵبگرن ، چونکە کات درەنگە‌و ئەوانیش توانای رۆیشتنیان نەماوە ؟ ئەو سوارەش گوتی : لەبەر ئەوەی من بۆ شارەزایی لە پێشەوە دەرۆم ناتوانم ئێسترەکەی خۆمتان بدەمێ ، بەڵام ئەوانەی دواوەش هەر مێ منن‌و رایانگرن ... کابرا قسەکانی تەواو نەکردن ، شەریف

کلاشینکۆفەکەی هێنایە خوارێ و میلەکەی هێنایەوەو ڕایکێشاو گوتی :
– دابەزە، دەنا دەتکوژم !
ئەو دەنگە ترسێکی وای نایەوە کابرا خۆشی نەیزانی چۆن لەسەر پشتی ئێسترەکەی دابەزیو گوتی : ئەوە وەلاغەکانم ، بەلام دەنگ مەکەن ،چونکە دوژمن زۆر نزیکە !
–مادام دەزانی کە دوژمن زۆر نزیکە بۆچی پیاوانە وەلام نادەیتەوە ؟ نامەرد !
پێمان وابوو دوژمن گوێی لەو دەنگە دەنگە بوو ، بۆیە تا ماوەیەك دەمانگوت : هەر ئێستا نا ئێستا دەدرێینە بەر دەستڕێژ ، چونکە ئەوکات ڕێك بەرامبەر بە ڕەبایەکانی کورتەك بووین !
کابراش هەر پێی وابوو ، بۆیە هەردوو ئێسترەکەی بەجێ هێشتن‌و گوتی : من لە سەرەوە چاوەڕێتان دەکەم . لە کاروانێکی تریش ئێسترێکمان خواست‌و هەڤاڵە نەخۆش‌و پەککەوتەکانمان سوار بوون‌وخۆشمان ڕکاو ڕك بەرەو ترۆپکی زێرینەکێو هەڵکشاین .
کاتێك زەردە لە سەرانیاندا ئێمەش لە ناو ئەو زەردانەدا لەسەر ترۆپکی هەرە بەرزی زێرینەکێو لە پێش چاوی دوژمن بزربووین‌و ئاودیو بووینەوە .

* * * * *

بەیانی ڕۆژی چواردەی تەموز لەسەر زێرینەکێو بەرەو چیای بێرمکە دەچووین ، کەسمان شارەزا نەبووین ، بەلام ڕێگاکە بە جوانی دیار بوو و دەشمان زانی قاچاغچیەکان لە پێشەوەن . دنیایەکی چۆڵ‌و بێ دەنگ بوو . سەر شاخەکە بێ مۆلگەو بنکەی دوژمن بوو ، بەلام هەموو ساتێك ئەگەری پەیدابوونی مەفرەزەی

گەرۆکی جاشانو فرۆکەش هەبوو ، بۆیە رۆیشتن بەو نویژی نیوەڕۆیە ئەگەر لە ناچاری نەبوایەکارێکی نادروستو نا پەسەندیش بوو . خۆ ئەگەر دوژمن بەرنامەی هەبوایە،یان هەستی ئەوەی بکردایە پێشمەرگە لەو ناوە هەن ئەوا بێگومان داروبەردی ئەو چیایەی دەکردە ئاگر .

* * * * *

گەیشتینە سەر کانیەیەکو هاورێ قاچاغچیەکانمان دۆزینەوە ، ئەوان بارەکانیان دابەزاندبوونو وەڵاغەکانیان لە پەناو پەسارگان شاردبوونەوەو خۆشیان لە دووری کانیەکە ، لە ناو تەراشان تەقەت کردبوو . سەر کانیەکە زۆر ترسناک بوو ، بۆ ئەوەی زوو ئەوێ بەجێ بهێڵین بە پەلەپەل دەستو دەمو چاومان شووشتنو مەتارەکانمان پڕ کردنەوەو یەکسەر دوور کەوتینەوە . هەندێ گلەییمان لە برادەرە قاچاغچیەکان کردن ، بەڵام ئەوان دەیانگوت :

—لەوە لەسەرخۆ تر ناتوانین بڕۆین ،چونکە وەڵاغەکانمان باریان بەسەر پشتەوەیەو ئێمەش دەبێ بە پێی ئەوان بڕۆین .

هەر چۆنێ بێ ئەوەندە پێویستیمان بەوان نەمابوو ، چونکە بڕدانی هێڵە دۆزەخیەکەی سنوور بۆ ئێمە زۆر گرینگ بوو ،هەنگیش لە هێڵەکە پەڕیبووینەوە .

بۆنێکی زۆری کەلاکی گەنیو دەهات ، کاتێك پرسیارمان کرد، قاچاغچیەکان گوتیان : چەند رۆژێك پێش ئێستا ژمارەیەك هەلیکۆپتەری جەنگیو باری هێرشیان هێناو هەندێ لە دەوارەکانی قاچاغچیەکانیان کوشتنو ئەو بۆنە هی ئەو وڵاغە توپیوانەیە .

ئەو تەڕاشانەی خۆمان لەناودا شاردبوونەوە زۆر بەرز نەبوون ، بۆیە تیشکی هەتاو ڕاستەوخۆ لێی دەداینو بەو هۆیەشەوە لە گەرمان ناڕەحەت بووین ، بەلام فەرهاد مەنتك بە هۆی نەخۆشییەکەیەوە لە ئێمە زیاتر پەرێشان بوو ، کەچی دەیگوت :

– هەر بگەینە دەشتی هەریر ، دەمو دەست دەچینە مالی مام ڕەمەزانی برادەرمو لەوێ پشوویەکی باش دەدەینو ئەو کات هەموو ناخۆشیەکانی ڕێگامان لە بیر دەچنەوە !

فەرهاد مەنتك بەو ئومێدەوە دلی خۆی دەدایەوەو شایانی باسە زووتریش چەندین جاری تر باسی مام ڕەمەزانی برادەری بۆ کردبووینو هەموو جارێکیش دەیگوت : بەس بگەینەوە لای ئەو ، هیچ کێشەیەکمان نامێنێ ! تا وای لێهات ناوە ناوە موحسین بانی مارانی بۆ خۆشییو پێ ڕابواردن باسی مام ڕەمەزانی دەکردودەیگوت :

مەڤالٚ فەرهاد چەندی ماوە بگەینە مالی مام ڕەمەزان ؟

سەرەتا مەڤالٚ فەرهاد پرسیارەکەی بە ڕاست تێدەگەیشت، بۆیە وەلامی دەدایەوە ، بەلام دواتر قەلس دەبوو ، زۆر جاریش پێی دەگوت: عەیبە قەشمەری بە شت مەکە .

* * * * *

بەرە بەری ئێوارە لە ناو تەڕاشان هاتینەدەرو دیتمان ئەو ناوە پڕ پڕە لە خەلكو وردە وردەش قاچاغچیەکان لە کونەکانیان و بن پەساران دەهاتنە دەرەوە هەمووشیان چەکدارو زۆربەشیان قاچاغچی زیتەلە بوون ،هەر دەتگوت قەرەبالغییە ناوەختەکە شانە مێروولەیەو دەربۆتەوە ، چونکە کە ڕۆژ ئاوابوو سەر کانییەکە هێندە قەرەبالغ بوو هەر جمەی دەهاتو سەرت

دەسوڕما لەوەی ئەو هەموو خەڵکە لە کوێوە هاتنە دەرەوە !
ئینجا تێگەیشتین کە ئەوێ کاروان سەرایەو قۆناغی هەرە گرینگی هاتوچۆی نێوان قەندیلو بیتوێنە .

لەگەڵ قاچاغچیە برادەرەکانمان بەڕێ کەوتینەوە، بەڵام دیسان زۆری نەبرد لە پێش چاوان ئاوابوونەوەو ئەمجارە هەرچەند ڕۆیشتین هەر نەگەیشتینەوە ئەوان . لە دوو ڕیانێکدا ڕێگای باکورمان گرتەبەرو کاتێکمان زانی بەرامبەر ناودەشت بووینەتەوە ، واتا بەرەو دواوە گەڕاوینەتەوە ! لە نیوەی ئەو ڕێگایەی کە بڕیبوومان بەبێ ئەوەی گوێ بدەینە دیاربوونو دیارنەبوونی ڕێگا یەکسەر لە چیای بێرمکەدا بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشتین ،چونکە یەکەم بە ئاراستە سەرەدەریمان لە شوێنەکان دەردەکردو دووەمیش لەبەر ئەوەی پیادە بووین دەرفەتی ڕۆیشتنمان بە هەموو شێوەیەك زۆر لە بار بوو . هێشتا شەو بە نیوە نەبوو بوو مام هادی داوای ئاوی کرد !

–ئەدی مەتارەکەی خۆت ؟

–ئاوەکەی خۆم تەواو بوو !

–خۆ ئێمەش هەر یەکەو مەتارەیەکمان پێیەو ئاو بۆ تۆ لە کوێ بێنین ؟

–بەخوا ئەگەر چارێکم نەکەن لەوە زیاتر ناتوانم بڕۆم !

هەرچۆنێ بێ قومێك ئاومان دایێ، بەڵام ئەو بە قومێكو دووانو سیان بڕی نەدەشکاو ئاوە ئاوە داوای هەر دەکردەوەو دەبوو ئێمەش دلوا قورسو گەورەکەی جێبەجێ بکەین .
لەسەر باسکێك دەڕۆیشتین ، باکورو باشورمان دوو دۆڵی زۆر قووڵ بوون . پێمان وابوو لە کۆتایی باسکەکە دەگەینە سەر دۆڵەڕەقە ، بەڵام وا دەرنەچوو ، دۆڵێکی شێوە چاڵی قووڵمان

هاتە پێش ... چی بکەین ؟ هەڤاڵ جەلال مستۆکو هەڤاڵ محەمەدیش زووتر دۆڵەرەقەیان دیبوو و شارەزای بوون . بەلام ڕێگایەکیان بۆ ئەوێ نەدەدۆزیەوە . لەوێ لەسەر ئەو بەرزاییە دانیشتینو سەیرمان کرد ئاوی هەموومان لە تەواو بووندایەو نەمانی ئاویش گرفتێکی گەورە بوو . کە بەرەو باشور ڕادەماین چوارقورنە بە جوانی دیار بوو.. گڵۆپە زەردو سوورو سەوزەکان دەدرەوشانەوەو چاوبازییان لەگەڵ تاریکی شەودا دەکرد و ئێمەش لەو سەر شاخە بە دوای ڕێگایەکدا دەگەڕاین وبە ئەزرەتەوە سەیری درەوشانەوەی ئەو گڵۆپانەمان دەکردن .

سەیر لەوە بوو لەو سەر شاخە ئاراستە جوگرافیەکانمان لەبەر چاوان گۆڕابوونو چوارقورنە بە پێچەوانەوە لە باکوردا دەبیندرا ! خۆ دەمانزانی کە باکور هیچ جۆرە ئاوەدانیەکی لێ نیە ، دەنا بێگومان چوارقورنەشمان نەدەناسیەوە ! دیارە ئەو گۆڕانەش بە هۆی ماندوێتی، نەشارەزایی ، تاریکایی بوو ، کە بینایی چاوانو چەقی هاوسەنگییان لە خشتە بردبووین .

* * * * *

لەو بەرزیە کە لە دۆڵە خڕەکەی شێوە چاڵ ڕادەماین دارو بارێکی چڕمان بەدی دەکردو پێمان وابوو ئەو درەختە بالا بەرزانە درەختی بەراون ، بۆیە بڕیارماندا بەرەو ئەوێ خۆمان غلۆر بکەینەوەو گوتمان : دەچینە سەر ئەو ئاوەو تا بەیانی لەوێ دەبینو ، بەیانیش بە ڕۆژ ڕێگاکەمان دەدۆزینەوەو دەڕۆین .

وردە وردە چووینە خوارێ تا گەیشتینە ژێر دارە بەرزەکان لەوێ دیتمان درەختەکان داری بەڕوو ،مازوونو هیچ ئاویشی لێ نیە . زۆر نیگەران بووینو هەر لەناو دۆڵەکەدا چەند چاڵێکی وەک بیر هەبوون ، بەلام فراوانترو کراوەتر بوونو

هەرچەندە بێ ئاو بوون ، بەڵام هێشتاش تەختایی بنەوەیان هەر قوڕ بوو، واتا لە مێژ نەبوو ئاویان لێ بڕابوو . ئەو چاڵانە وەك زارکی گڕکانەکان وابوون و پێدەچوو هەزاران ساڵ پێشتر خامۆش بووبنەوە . هەناسە ساردو نیگەران بووین ، بەڵام تازە چووبووینە خوارەوەو سەرکەوتنەوەش بۆ هەموو لایەکان سەختتر بوو ، ناچار لە هەمان جێدا پاڵ کەوتین ، بەڵام خنکام خنکامی مام هادی و ویزە ویزی پێشکان ئۆقرەیان لێ هەڵگرتبووین و نەیاندەهێشت سەر خەوێك بشکێنین .

کۆڵەپشتە قورسەکانمان خستنە ژێر سەرمان و پاڵمان دایەوە . من هەر خەوم لێکەوت و لێ نەکەوت زوو چوومە جیهانی خەونان و لە خەوما لەسەر ڕووبارێکی بە خوڕ بووم ، ڕووبارەکە هاژەی دەهات و هەر بۆ خۆشیی دەستم تێوەردەدان و ئاویشم نەدەخواردەوە ، ناوە ناوەش دڵۆپە ئاوی سارد بە بەر چاوم دەکەوتن و لە پڕ دەستێکم لە دەم و لێوەکانی خۆمدا و کە بە ئاگا هاتمەوە مێشوولەیەك کە بە لێوی ژێرەوەمەوە دابوو دیتم کوشتوومەو دڵۆپە ئارەقیش لە نێو چاوانمەوە زەنگوڵ زەنگوڵ دەبارینە سەر ڕوومەتەکانم و لەوەوە زانیم ویزە ویزی پێشکانم لێ بووبوو بە هاژەی ئاوو دڵۆپە ئارەقەکانیش بە دڵۆپە ئاوی ڕووبار ! ئیدی وەئاگا هاتمەوەو چیتر خەوم لێ نەکەوتەوەو تا بەیانیدا بێدار بووم و بیرم لە زۆر شت دەکردەوەو قومە ئاوێکی تریشم دا بە مام هادی .

* * * * *

بەیانیش هەستاینەوەو بەرەو ڕۆژئاوا بەو بەرزاییەدا هەڵکشاین کە لە پێشمان بوو، مام هادیش هەردەیگوت : — خنکام ! ئەی هاوار خنکام .

لەبەر ئەوەیش زۆر بە خۆڕی بوو ئاویش لە بنی مەتاران نەبڕ نەمابوو ، بۆیە چیتر کەس ئاوی نەدەدایە ، بەڵام ئەو دیسان یەخەی منی گرتەوەو ناچار بەو مەرجە مەتارەکەی خۆم دایە دەست کە قومێکی بچووکی تەنیا بەشی دەم تەڕ کردنەوە بکا ، لێبدا . کەچی ، ئەو کە دەمی پێوەنا کزەی لە دڵەوە مێناو خەریك بوو چۆڕ بڕی بکات ! منیش دەمویست بۆ کاتی پێویست چۆڕێك ئاوم هەر پێ بێ ، بەڵام ئەو هەر خۆیو ئەو ساتەی لە بیر بوو کە تیایدا دەژیا ، بۆیە بێباکانەی دەخواردەوە .

کە بەسەر بەرزاییەکە کەوتین لە نزاری ئەو دیو کەویە بەفری گەورە گەورە دیار بوون ، بە دیتنی ئەو کەویە بەفرانە دڵمان خۆش بوو ، چونکە ئەگەر زۆر پێویستی بکردایە دەمانتوانی خۆمان بگەیەنینە سەریان .

سەرچیاو سەرچیا ڕۆیشتین لەم لاو ئەو لاشمان دەیان دۆڵو شیوو لوتکە هەبوونو لە زۆر جێگایانیش دووراو دوور کانیمان دەدیتن ، بەڵام دەبوو تا دەکرێ بڕۆینو خۆمان لەو چیاو چۆڵانە گیرو گیرۆ نەکەین .

دوای هیلاکیو مشەقەتییەکی زۆر دۆڵە ڕەقەمان لێ بە بەدەرکەوتو ئۆخەیەکمان لە خۆمان کرد . لەسەر بەرزاییەك بەرامبەر بە دۆڵەکە ڕاوەستابووینو دیتمان ڕێگاکە بۆ شۆڕبوونەوە ناو دۆڵەکە لە باشوری ئێمەوەیەو مەودایەکیزۆری هەیە ، بۆیە ویستمان قەدبڕ لێ بدەینو بێ ئەرکترو زووتر بچینە خوارێ . لەسەر چیاکە تا سەرەتای تەختایی ناو دۆڵەکە زیخەڵان بوو ، بەدەم ڕۆیشتنەوە لەو نشێوە زوو زوو دەکەوتینو هەموو جارێکیش تۆزێك غلۆر دەبووینەوە . لە پڕ مەڤاڵ کاوێسو مەڤاڵ شەریف کۆڵەپشتەکانیان دانایە ژێریانەوەو دانیشتنە سەریانو

خۆیان خلیسکاندو بەدوای ئەوانیشدا ئێمە دوو هەڤاڵی تر بە هەمان شێوە سواری کۆڵەپشتەکانمان بووین و چەوو زیخەکەش بە خێراییەکی سەر سوڕهێنەر بەرەو خوارەوەی دەبردین و ماشەی خشینی شەپۆلەکانی زیخەکە ڕۆژە ڕێیەك دەڕۆیشت و تۆزەکەش وەك گەردەلوولێکی گەورە بەرەو ئاسمان بەرز دەبووەوەو دەتگوت ئاسەواری سووتاندنی گوندەکانی کوردستانی سەردەمی ئەنفالە . بۆ ئەوەی کۆنترۆڵ لە دەست نەدەین و تووشی هەڵدێرێك نەبین و هەر ساتێك بمانەوێ خۆمان پێ بگیرێتەوە بە هەردوو دەستەکانمان لەم لاو لەولامان ئەو بنە گیا چەورەمان دەگرت و ئەوی ترمان بەردەدا کە بە پانایی زیخەڵانەکە ڕووا بوون و لە شلکیان شنە شنیان دەچوو .

هەرچەندە ئێمە لەسەر چیایەکی بەرزی کوردستان خۆمان لەسەر زیخەڵان دەخلیسکاند ، بەڵام هێندە خۆش و کەیف ساز بوو هەزار خۆ خلیسکانی سەر بەفری چیاکانی سویسرای بەقوربان بێ . کە گەیشتینە خوارەوەش کۆڵەپشتەکانمان هەلگرتنەوەو وردە وردە بەرەو ئەو کانییە چووین کە زووتر لەسەر چیاوە لێمان دیار بوو

* * * * *

زۆر تینوو و تامەزرۆی ئاو بووین ، بە پەلە بووین تا دەیگەینێ و هەر کە گەیشتیشین سەیر دەکەین پیاوێك لە ڕۆخی کانییەکەدا خەوتووەو کڵاشینکۆفێکی پەڕەشووتی جوانی خستۆتە ژێر سەری . کابرا هەستی بە ئێمە کردو لە سەرەخۆ هەستایەوەو چاك و خۆشی کردو دوای پرسیار کردن گوتی : من جاشی سەر بە سواراغام ! ئەدی ئێوە سەر بە کێن ؟

– ئێمەش مەفرەزەی کاك محەمەدی عەلی ئۆمەرین !

کابرا بە جاش لە ئێمە گەیشتو ئێمەش خۆمان کردە مەفرەزەی هەڤاڵ محەمەدی خۆمان !. کاتێك لە کابرامان پرسی :
–تۆ بە تەنیا لێرە چی دەکەی ؟
گوتی :
–من هاتوومەتە سەردانی خزمەکانم کە لەو خوارە ڕەشماڵیان هەڵداوەو ئەمساڵ سواراغا مۆڵەتی بۆ وەرگرتوون .
کابرا ئامادەیی خۆی بۆ هەموو هاوکارییەك نیشانداو گوتیشی :
–خۆزگە دوێنێ لێرە دەبوون ، چونکە کاك سەعیدو مەفرەزەکەی لێرە بوونو لەسەر ئەم کانییە بزنێکیان سەر بڕیو خواردیان !
–خۆزگە !
ئێمە ئەو قسانەمان کردبوو کە چەند هەڤاڵێك تازە بە تازە دەگەیشتن ، چونکە ئەوان نەیانتوانی بە خشخشۆکانێ دابەزن ، بە پەرپیانەوە چوویینو مەسەلەی کابرامان تێگەیاندن . پشوویەکماندا ، ئینجا دەستو قاچەکانمان شۆردنو دواتر ئاوە تەزیەکەمان خواردەوە و ڕێگەشمان نەدا مام هادی بە ئارەزووی خۆی بخواتەوەو خۆی ماڵوێران بکات .
–ئای ! لەو ئاوە ساردو سازگارە لەگەڵ یەکەم قوم هەموو گیانی تەڕو هەناوی فێنك دەکردەوە .
کۆڵەپشتەکانمان سووك بوو بوون، چونکە ماوەی چەند ڕۆژێك بوو هەر لەو خواردنەمان دەخوارد کە هەڵمان گرتبوو . لە وێش چەند قوتیە ماسییەکمان شکاندنو لەگەڵ نانە ڕەقەمان خواردن ، هەرچەندە کابرا زۆر داوای دەکرد بچێت لە لای خوارەوە نانمان بۆ بێنێ ، بەڵام ئێمە ڕێگەمان نەداو سوپاسمان کرد !.
بە هۆی ڕۆژانە بەرزەکانی قەندیلو زنجیرەکێو هەموومان کەم تا زۆر دەمو چاومان سووتابوونەوەو هەندێکیشمان ڕەش

هەلگەڕابووین . کاتی نیوەڕۆ هەڤاڵ فەرهاد مەنتك و هەڤاڵ شەریف ، پشوودان و ئاوەکەیان بە هەل زانی و کراسەکانیان و سەریان بە ملدا شووشت . لەو ماوەیەشدا لەگەڵ کابرا بەردەوام لە گفتوگۆدا بووین و پرسیاری پێویستمان لێ دەکردن و ئەویش هەمووی بە باشی وەڵام دەدایەوە ، بەڵام هەر کە بینی هەڤاڵان جلەکانیان و سەریان دەشۆن پەشۆکاو کەوتە گومانەوە .هاتە لای من و سوێندی دام کە بەڕاستی وەڵامی چەند پرسیارێکی بدەمەوە و منیش دڵنیام کردەوە ، ئینجا گوتی :

–ئێوە چین ؟

–جاش !

–جاشی کێ ؟

–محەمەدی عەلی ئۆمەری !

–باشە ئەگەر ئێوە جاشن بۆچی جلەکانتان هێندە چڵکن و خۆشتان ئەوەندە دزۆنن و هەموو دەم و چاویشتان لەبەر تیشکی خۆری کوێستانێ سووتاونەتەوە ؟!

–چونکە چەند ڕۆژێکە بە مەفرەزە دەگەڕێین و دەسووڕێین !

–ئەدی ئەو برادەرانە بۆچی جلەکانیان لێرە دەشۆن ؟

–لەبەر ئەوەی چڵکنن !

دیاربوو کابرا دڵی شاوی نەدەخواردەوە و هەر سەری بادەداو لە دڵە ڕاوکێیەکیی توند دابوو ، ئینجا گوتی : ئەگەر کارێکتان بە من هەیە لە خزمەتم ، دەنا حەز دەکەم مەرەخەس بم ؟

–ئاخر ئێستا نابێ ، چونکە کارمان پێت دەبێ .

کابرا هێندەی تر پەشۆکاو بە غەریبی و بێ دەسەڵاتی بە شێوەیەك سەیری دەکردین من بەزەییم پێیدا دەهاتەوە .

دوا جار گوتی :

–تو ئەو خوایەو تو ............ ئێوە جاشن یان پێشمەرگە ؟
–باشە تۆ حەقی ئەو مەسەلەیەت چییەو بۆچی هێندە بە دوایدا دەچی ؟
–کاکە دەزانی من مەبەست دەکەم لێم قەوماوە ،چونکە گوتوومە جاشمو دەشترسم ئێوە پێشمەرگە بن ! ئەگەر دەشڵێم پێشمەرگەم دەترسم ئێوە جاش بن و بە هەردوو سەرەکەیش سەرم تیا دەچێ ؟! .. بیکەن بە خاتری ئەو خوایە ئێوە هەرچییەك هەن من لێ قەوماوم و هیچی خراپم لەگەڵدا مەکەن !
کابرا درێژەی پێداو گوتی : ئەوە بەدبەختیو ماڵ وێرانی کوردە ئێمە وامان بەسەر هاتووەو بە خوا نازانم نە ڕاستی بڵێمو نە درۆتان لەگەڵدا بکەم !
کە ئەو قسانەی کردن لە ناخەوە هەژامو هەمو ترازێدیاکانی گەلەکەم لە قسەکانیدا دەدیتەوەو بە پەرێشانیەوە گریان بینە قاقای گرتمو خەریك بوو بۆی بسووتێم . بۆیە پێم گوت : ئێمە پێشمەرگەینو تۆش لە خۆت مەترسەو دڵنیابە .
لەگەڵ ئەو وەڵامەم کابرا واقی وڕماو هێندەی تر حەپەسا ، زۆر دەترسا ، بەڵام بۆ تەواو دڵنیا بوونەوەی دەیگوت : ئێوە نانو پێخۆرتان کەم پێ ماوەو دەچم لەو ماڵە خزمانەم بۆتان دێنمو ئەگەر بڕواشم پێ ناکەن دوو کەسم لەگەڵدا ڕەوان بکەن!
ئێوارە کاتێ بەڕێکەوتین لە جیاتی ئەوەی جاشەکە چەك بکەین (هەرچەندە نابێ بەڵام هەر بۆ دڵنیایی) چەند پاکەتە فیشەکێکی نوێم پێ بەخشین ، دیاربوو بەو پاکەتە فیشەکانە هەر زوو گەشایەوەو زۆر کەیفی پێ هاتو خۆشحاڵ بوو، بۆیە گوتی :

– هەتا ماوم ئەم پاکەتە فیشەکانە وەك یادگاری هەڵدەگرمو ئێوەش هەرگیز لە بیرناکەم .

* * * * *

لەبەری نزاری دۆڵەرەقەدا شۆڕبووینەوەو پێش ڕۆژئاوا گەیشتینە سەر گردۆلکەیەکی بەرزی بەرامبەر بە وێرانە گوندی دارەبەن کە بارەگایەکی پێشمەرگەی کوردستانی ئێرانی لێ بوو ، دیتمان پێشمەرگەکان خەریکی تۆپ تۆپێن بوون . لەبەر ئەوەی ئێمەش چەند شەوو ڕۆژێك بوو بە ڕێوە بووین ، خۆزگەمان دەخواست بمانتوانیایە لای ئەوان پشوویەك بدەین ، بەڵام چوونە لای ئەوانیش کارێکی ئاسان نەبوو . تا تاریکایی باڵی بەسەر ئەو چیاو دۆڵانەدا کێشا بە دیار جادەکەوە دانیشتین ، ئینجا لە شۆڕبوونەوەی خۆمان بەردەوام بووینو درێژەمان بە ڕۆین داو لە نزیك پردەکەی دارەبەنی دۆڵی شاوێ لە جادەی پلینگانێ پەڕینەوە .

* * * * *

لە نیشتمانی بێ هاونیشتمانیدا لە ترسی چاوو هێزی داگیرکەران بەم شێوە چیاودۆڵو هەڵدێری هەزاری بە هەزاریمان دەبڕین ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە سەختی ڕێگاکانو دلڕفێنی دیمەنەکان خۆشییەکی سەیرمان هەست پێدەکردو لە هەمان کاتیشدا شانازی کردن بە بێ منەت بوون لەو دوژمنە زەبەلاحەو وابەستەییمان بەو خاکەی ئاوایییەکانی وێران کرابوونو خەڵکەکەی ڕاگوازرابوون تینی بەردەوام بوونو نەسڵەمینەوەی پێ دەبەخشینو بە چاو کراوەییو ئومێدی بەرزەوە ڕێگا سەختو دوورو درێژەکەمان دەبڕیو دەچووینە پێش.

* * * * *

به ڕێگای پاش تەلانیدا ڕۆیشتین ، لەو دۆڵە جوانو هەمە ڕەنگەداو بەو شەوە تاریکە لە دوورەوەرا تروسکایی ئاگرێکمان بەدیکرد . لەبەر ئەوەی تروسکاییەکە لە نزماییدا بوو یەکسەر زانیمان شوێنەکە ڕەبایەی دوژمن نیە ، بە پارێز پارێز بەرەو ئەوێ چووینو دیتمان پیرەمێردێکو پیرەژنێك لە ژێر پیرە دار توویەکی بەرز بەسەرهاتی سەردەمی لاوێتی خۆیان بۆ یەکتری دەگێڕنەوە . دیتنی ئەوانمان هێندە بەلاوە سەیر بوو بڕوا نەکرێ !چووینە لایانو ئەوانیش هەرکە چاویان بە ئێمە کەوت واقیان وڕماو دوای چاکو چۆنی زانیمان ئەو ماڵە مۆڵەتیان وەرگرتووە تا بۆ ئاژەڵ لەوەڕاندن ئەو هاوینە بگەڕێنەوە ئەوێ ، بەلام پیرەمێردەکە میوان بوو . دوای تاوێك پیرەژنەکە چووە ئەولاترو ژنو پیاوێکی تری بانگ کردن . داوای هەندێ نانمان لێ کردنو دوای جێبەجێ بوونی داواکەمانو بەبێ ئەوەی خۆمان بناسێنین یاخود بچینە ناو پرسیارو وەلامانەوە لە پێش چاوی ئەوان بە پێچەوانەی ڕێگای خۆمان گەڕاینەوەو هەر کە لەوان ئاوا بووین بەلایەکی تردا ڕێگاکەی خۆمان گرتەوەبەر . سەیر لەوەدا بوو ئەوان هەستیان کرد کە ئێمە پێشمەرگەین ،بەلام هیچ پرسیارێکیان نەکرد ، تەنیا ئەوە نەبێ کە بە چاوی پڕ لە سۆزو ڕێزەوە سەیریان دەکردینو دوعای خێریان بۆ دەکردینو دەیانگوت :

— ئاگاداری خۆتان بن .. بە قوربانتان بین وریا بن .. خوا پشتو پەناتان بێ ...

دەردی هیلاکیو خەو هەڵمەتیان هێناو شەریف کە پێشمەرگەیەکی هەرە گورجو گۆڵو ئازای مەفرەزەکەمان بوو ئەو

شەوە لە خەوان قەدەمی شکاو هەر نەیدەتوانی بڕواو بجوڵێ ، وەزعی چەند هەڤاڵێکی تریش وەکو هی شەریفو هی هەندێکیشیان تۆزێك باشتر بوو . بە هەزار ناری عەلی تا گەیشتینە ناو کاولە گوندی گوڵان .
ئەی خودایە ئەوێ بۆ سەر خەو شکاندنێك ، یان پشوودانێك جێگایەکی پڕ لە نازو نیعمەت بوو !دارو درەختە بێ خاوەنەکان شنە شنیان دەچوو، دەنگی جۆگە ئاوەکانو شنە بای ماکۆك هێندە کاریگەر بوون ئێمەی ڕێبوار بە ساناپی مەست بکەن .
گوڵان بەهەشتێکی بێ خاوەن بوو ، بەڵام چاوی دوژمن کوێر بێ نەماندەتوانی لێی بەهرەمەند بین . کە چووینە سەر کانییەك نوو کەسمان دی لەسەر تاتەکە نووستبوون ، هیچ چەکیان پێ نەبوو ، بەڵام نە لە ئێمە دەنگو نە لەوان دەنگ بە ئەسپایی بۆ پێ ونی بەلایەکی تردا لە ناو کاولە گوندە بەهەشتیەکەدا دەرچووین .
چەند برادەرێك هەوڵیاندا لە دەرەوەی گوندەکە بمێنینەوە ، بەڵام نەدەگونجا . شەریفو مام هادیو حسێن ئەوپەڕی هەوڵیاندا مۆڵەتیان بدەین لەوێ بمێننەوەو ئێوارەی دواتر لە زۆزانی سایە یەکتری بگرینەوە ، بەڵام ڕێگایان پێ نەدرا . وردە وردە هەڵکشاین، خەریك بوو ڕۆژ بێتەوەو ئێمەش هێشتا نەگەیشتبووینە جێگایەکی قایم ، لەو بەرۆژەی بناری چیای بێترخێن مێرگێك دیار بوو ، یەکسەر بەرەو ئەوێ چووینو تا گەیشتین بە تەواوی ڕۆژ بووەوەو لە بێ بەختی ئێمەش مێرگەکە ئاوی تیا نەمابوو، تەنیا پونگو قوڕو لیتە بوو . شوێنەکەش وا هەڵکەوتووە لە هەموو ڕەبایەکانی دەوروبەری جادەکە دیارە ، بۆیە نەدەکرا لەوە زیاتر بجووڵێینەوەو سەرەتا لەبەر هیلاکیو

فێنکایی بەیانی زۆر هەستمان بە ناڵەباری شوێنەکە نەکرد ،بەڵام هەرکە لەناو قوڕو پونگە چڕەکەدا سەر خەوێکمان شکاند و خۆریش بەرز بووەوە لەو بەرۆژە ڕووتەنە خەریك بوو هەڵبڕوکێین‌و بۆنی پونگەش هێندە تیژ بوو پەرێشانی کردبووین ، بەڵام لەبەرگە گرتن بترازێ هیچ چارێکی ترمان نەبوو .

تا پێش ڕۆژئاوا بوون بە هەرچی حاڵێکی هەبوو ئۆقرەمان گرت ، ئینجا بە ڕێی سایەدا ڕۆیشتین‌و هێشتا ڕۆژ هەر مابوو کە لە هەورازی سایە سەرکەوتین‌و کێشەی نەشارەزاییشمان نەماو لەوێ بە دواوە هەموومان باش شارەزای ناوچەکە بووین.

* * * * *

شەوی ١٨/١٧ ی تەموز گەیشتینە وێرانە گوندی مەلەکان . لەبەر ئەوەی گوندەکە لە ناو دۆڵێکی تەنگو قووڵ و زۆر پڕ دارو درەختیش بوو هێندە تاریك بوو چاو چاوی نەدەبینی . بە ئەسپایی‌و یەك لە دوای یەك ڕێچکەمان بەستبوو ، بە هۆی سووتاندنی کاتی خۆی خانوویەرەو باخەکانیش هەزاران تەن دارو درەخت‌و کەڵەکە بەرد بەسەر یەکتریدا کەڵەکە بوو بوون . بۆ ئەوەی نەکەوینە ناو چاڵ ، جۆگە قووڵەکان ، کەلێنی دارو بەردان پشتی یەکتریمان گرتبوو. لە جێگایەك عاسێ بووین ، جەلال مستۆك کە لە پێشەوە ڕێ ڕوونی دەکرد ، ماوەیەك وەستا تا توانی بە سەلامەتی لە جۆگەیەکی قووڵ بپەڕێتەوەو ئێمەش بۆ نۆرە وەستابووین . محەمەدی عەلی ئۆمەری لە دوای منەوە بوو تومەز لە کاتی وەستاندا لە پشت دار گوێزێك دەوەستێت و چاوەڕوان دەکاو سەیر دەکا زەلامەکەی پێشی ناجوڵێ ! کە دەزانێ ڕەشاییە باڵا بەرزەکە دار گوێزەو جەلال نییە ! بەپەلە دێ‌و ڕێك کەوتە ناو جۆگەکەو بووە تەقە تەقی کلاشینکوفو

تاقمەکەی ، لەبەر ئەوەی ئازاری زۆری خوارد یەکسەر هەڵچووو لەناو جۆگاکە هاواری کرد :

–جەلال مستۆك سەگباب بۆ وات لێکردم ؟

منیش لێم پرسی : چی بوو کاك محەمەد ؟

تورەتر وەڵامی دامەوەو گوتی : هەموو گیانم شکا ! ئەو سەگبابە لەو شوێنە ناخۆشە بێ دەنگ پەڕیەوەو بە ئێمەی نەگوت !.

کە زانیم هەڵەی کردووەو منیش بە جەلال مستۆك تێگەیشتووە خۆم بێ دەنگ کردو دەستم گرت تا هاتە دەرەوە ، بەڵام ئەو لە جوێن دانو تورە بوونی خۆی هەر نەکەوت ! . هەرچەندە ئاگر کردنەوە بە هیچ شێوەیەك پەسەند نەبوو ، کەچی ئەو لەو تورەبیەوە دەنکە شقارتەیەکی داگیرساند ، لەو تاریکاییە و لە جێگایەك کە هەموو دەم ئەگەری لێ بوونی مەفرەزەکانی دوژمنی لێ بوو هێندە بە شۆق بوو ، هێندە بە شۆق بوو لە پێش چاوی ئێمەدا تەواوی دۆڵەکەی ڕووناك کردەوە ! بە ڕاستی شۆقێکی زۆرو سەیری هەبوو ! ڕاستە ئەگەر تاریکایی هەموو دنیا نەتوانێ ڕوناکی مۆمێك بشارێتەوە، ئەوا تروسکاییەکی ڕوناکیش دەتوانێ ئەستورترینو ڕەشترین پەردەی تاریکی بسمێ هەموو دەورو پشتی خۆشی ڕابماڵێو رووناك بکاتەوە ....

ڕۆیشتن لە ناو گوندەکە زۆر ناخۆش بوو ، بۆیە هەنگاو هەنگاوو لە سەرەخۆ دەچووینە پێش . لە ناوەڕاستی گوندەکە هەستمان ڕاگرت دنیا کپو بێ دەنگ بوو ، چووینە سەر کانییەك ولە کەشێکی زۆر فێنكو بێ خوستدا تا بەیانی لەسەر پاشماوەو ناو وێرانەی مێژوو و ئاوەدانی ماندیو برسی ڕووەو ئەستێرە پرشنگدارەکانی تاقی ئاسمانی دۆڵە قووڵەکە لەناو ژاوەژاوی بیرەوەریەکانو پێش بینییەکانی داهاتوودا ئۆقرەمان گرتو دوای

نوسینی لیستی پاسەوانیی لە دووری یەکتری‌و بە بەر بڵاویەوە تا بەیانی لێی ڕاکشاینەوە .

* * * * *

شەو ، لە ناو سامناکیی وێرانەی مەلەکان مابینەوەو ، بەیانیش کە تیشکە زێرینەکانی خۆر لەسەر لوتکەکانی چیای ئاراسن شۆڕبوونەوە ، پێش هەموو شتێك شوێنەواری مەفرەزەکانی دوژمنمان لە هەمان شوێن بەدی کرد . پاشماوەی خواردەمەنیەکان‌و ئاگری گەورە نیشانەی ئەوە بوون کە ڕۆژێك دوان زووترمێژێکی دوژمن لە هەمان شوێنی ئێمەدا بووە ، چونکە ئەو کات هەرگیز نەدەبوو پێشمەرگە بەقەد ئەوە هیچ جۆرە ئاسەوارێك لە دوای خۆیان بەجێبێڵن کە هەستی پێ بکرێ .
مەلەکان ، لە سێبەری مێژوودا بۆنی سەردەمانی فەرمان‌و فەرهودو قڕان‌و وێران‌و کیمیا باران‌و ئەنفالی لێ دەهات .. لەو زەمان‌و زەمینەیەشدا من بە تاسەوە خۆزگەم دەخواست کە شاخ‌و دارو بەردو ئەشکەوتەکانی دەهاتنە دەنگ‌و ئەوەی دیویانە هەموویان بۆ دەگێڕاینەوە تا بمزانیبایە ڕۆڵەکانی ئەم دۆڵ‌و شاخانە بە درێژایی مێژوو چیان بەسەر هاتووەو چییان دیووە .مەلەکان ،گوندێکی وێرانی وڵاتێکی دەیان جار سووتاوو خاپوورکراو ، هەر لە دوای ئەنفالەوە بێ دەنگ لێی خەوتبوو، هێشتاش کیمیایی بەرۆکی سێیەکانی هەر بەر نەدا بوو ، خەڵوەت‌و فەنابوونی لە عیشقی ڕۆڵەکانی هێندە قووڵ بوو مەگەر بە گەڕانەوەیان دەنا چ هێزێك هەبوو لەو سەردەمەی سڕبوونەدا وە ئاگای بێنێتەوە ؟ ئەشکەوتە مێژووییەکانی شاهیدی هەزاران ساڵەی ژیانی خۆش‌و ناخۆش‌و شین‌و شایی‌و سەرکەوتن‌و ژێرکەوتن‌و داگیر کردن‌و ڕزگارکردن بوون‌و کوردیش دەڵێ ئاوو

ئاوەدانی ! بەڵام ، لەو ڕۆژگارەدا تەنانەت چیاو ئەشکەوتەکانیش نەیانتوانی بوو داڵدەی ڕۆڵەکانیان بدەنو ئاویش بێ ئاوەدانی هەر لە سەروچاوی (باران)ەوە تاکو کانیی ئەسپینداریو گەلی بلەو دۆڵی ئالانە بێ نازو بێ خاوەن بە نێو کاولە گوندەکانی گۆڕەشێر ، تاریننانی ژۆری ، تاریننانی ژێری ، دارەگرد ، بەردوك ، بلەی ژۆری ، بلەی ژێری ، دا دەڕۆیشتو کەسێك نەبوو جۆگەلەیەك ،یان میزاوێکی بۆ ژێر ئەو درەختانە ڕابەستێ کە بەو چلەی هاوینە ، لەم بەرو ئەوبەری تامەزرۆو عاشق بەرامبەر بە خورەو ڕەوانی هەڵدەکزوران و قرچ قرچ دەسووتانو ئاویش لە هەژمەتان خۆی دەبووەوە بە فرمێسکەکانی خۆیو بۆ دڵدارەکانی دەتوایەوەو بێ هودەو بێ دەستی خۆی وەك ڕۆڵەکانی سەر بەرەو خوار دەڕۆیشتوکەس نەیدەدیونەیدەنۆزیەوە . ئاو بۆ درەختە بەراوەکان دەتوایەوەو بە هەرچی حاڵێك بوو ئاهو هەناسە هەڵمییەکانی بۆ دەناردن ودرەختەکانیش بۆ دڵدارە سازگارەکەیان هەڵدەکزوران ودەسووتان ، دوو عاشق ، دوو خۆشەویست وەك ئەستێرەکانی لەیلاو مەجنون بەرامبەر بە یەکتری بە بێ لێك دابڕان و بەبێ گەیشتنە یەکتریش ئەم لە دوورو ئەو لە دوور بەم شێوە تامەزرۆییەی دڵداریی بە هەناسەی ساردو ئەزرەتێکی بێ کۆتایی زەمەنی بەردی برا برایان دەهۆندەوەو لاوکی دەست لێك بەردانیان لەبەر سەمفۆنیای پێنجەمی بیتهۆڤندا بە خورەو شنە دەچڕیو زەویو ئاسمانیان نوقمی ئازاری بێدار بوونەوە دەکرد .

ئەی خودای خۆشەویستیی دەبینی ؟ ئەی ئەفینی کەسکاییو ئاو تۆ کەی دەتوانی ئەم دووانە بگەیەنیتەوە یەکتریو ؟ ببیتەوە بەهەمان ئەو ڕایەڵەی سەوزایی تێکەڵی شینایی ئاسمانی ناو

زەنگوڵەی ئاوەکە بکەیتەوەو لە سووتانو سەرەڵگرتنی دووریی یەکتریان ڕزگار بکەیت ؟

* * * * *

ئەو گوندە بۆ من شێوەو مانایەکی جیاوازی هەبوو ، هەر لەو ساتەی پێمان وەناوی ئابوو بیرەوەریەکانی سێ مانگی شازدەساڵ زووتر ئاخیان دەجووڵاندم . حەزی دیتنەوەو چوونەوە ئەو هەوارەی شازدە ساڵ زووتر ماوەیەك بۆ خۆپاراستن لە بۆردومانی فرۆکەکانی دوژمن لەگەڵ چەندین خێزانی تردا وەك مرۆڤەکانی نیاندرتاڵ لە تەك یەکتریدا لێی ژیاین وەخشتوگیرەی خستمو هەر لەبەر ئەوەش بوو لە ناو چۆمی سەوزو وشكو شكاودا چوومە بەرامبەر ئەو کۆنە هەوارە کە لە کۆتایی هەشتاکانیش کرابوو بە خەستەخانەیەکی شۆڕش ، بەڵام کە سەیرم کرد چی ببینم ؟

دوژمنان ئەشکەوتە دێرینەکەیان بە زەبری بۆمباو دینامێت بەسەر یەکتریدا ڕووخاندبوو . ئەو ئەشکەوتەی سروشت دروستی کردبوو ئەوان ڕووخاندبوویان ، نەك هەر ئەوە بەڵکو بگرە ئەو خانوو و مزگەوتانەی کورد دروستیان کردبوون ئەوان ڕووخاندبوونیان ، ئەو مرۆڤانەی لەسەر ئەو خاکە لە دایك بوو بوون و ئەو ئەشکەوتانەی شاهیدی هەزاران ساڵەی ژیانی باووباپیرانی ئەوان بوون لەوێ ، ئەوان ڕایانگوازتبوون...جا داگیرکەران چیان بەسەر ئەم گەلە نەهێناوەو چیان بەو نیشتمانە نەکردووە ؟ هەی هاوار هاوار!... دادی بێ دادان !..

وەرن سەیر کەن : ئەشکەوتی بەسەر یەکدا ڕوخاو ، دەیان خانوی تەخت کراو ، دەیان باخی سوتاو ، ئێسكو پروسکی دەیان ئاژەڵو هەزاران باڵندە ، جاجمی دڕاو ، بێژنگی شکاو ، نیرو

ئامور ، دەستارو جۆنی ، دەیان قاپو قاچاغی فافون ، دەیان دار گوێزو ئەسپینداری بەسەر یەکتریدا ڕاقەتاو ، لانکێکی پارچە پارچە بوو ، بوکە شوشەیەکی کون کون ، پارچەکانی کۆنە ڕانکو چۆغەیەك ، دەستە جلێکی بێ ڕەنگو پچڕ پچڕ بووی ژنان ، سۆبەیەکی داران ، دەیان بەفرمالو باگوردان ، ئەدی ئازار ، ژان ، غەم ، فرمێسکەکانی ژن ، پیر ، منداڵ ، لاو ، پەککەوتە وەبەر کیمیایی‌و ئەنفالکەوتووەکان‌و دوور خراوەو بێ سەرو شوێنەکان ؟... سەدان گوللە تۆپ‌و پۆستاڵێکی فڕێدراو ببینەو ڕابمێنە داخوا بە چ پەخشانێك دەتوانرێ وەسفی ئەو دیمەنانە بکرێ ؟ ... داخوا چ شاعیرێك هەیە بتوانێ تەواوی هەستی خۆی بەرامبەریان دەربیڕێ ؟.. چ مێژوو نوسێك هەیە بتوانێ وردەکاریەکانی ئەم تراژیدیا گەورەیە بنوسێتەوە ؟.. هەواری خاڵی لە نیشتمانی خاڵیدا تووله ڕێی فرمێسکەکانی هەتا هەتایی دەکردنەوەو ناخی هەڵدەپروکاندن .. خودایە !.. خودایە ئەو هەمو تاوانە لە پای چی ؟ ئەو هەمو بێ دەنگییەت لە ئاستی ئەو هەموو گوناهانە تا کەی ؟ ......

لەو هەوارە ، سۆزی بیرەوەری‌و هەستی مرۆڤایەتیم دەکوڵان‌و فرمێسك لە چاوەکانم گوڕگوڕ دەهاتنە خوارێ‌و دڵیشم هێندە تەنگ بوو خەریك بوو هاوسەنگی گیانم تێکبچێ‌و بە جۆرێکی دی بگۆڕێم . حەزم دەکرد تیر تیر ، پڕ بە قوڕگم، درێژ درێژ ، بە درێژایی مێژووی گەلەکەم لە سەر ئەو خاکەدا هاوار بکەم وهاوار بکەم‌و بڕۆم‌و هەر بڕۆم‌و دێوانە ئاسا بەرەو کەس نەزان سەری خۆم هەڵگرم ، حەزم دەکرد بفڕم ، بتوێمەوە ، هەتا هەتا بنوم گرینگ ئەوە بوو بەرگەی دیتن‌و بیرکردنەوە لەو تراژیدیایە زۆر ستەم بوو ... لەو ساتانەدا ژیان ئاسان‌و ئاسایی

نەبوو ، بەلام مردنیش لە بەرژەوەندی دوژمنان بوو ، دەنا بێگومان زۆر خۆشتر بوو . ئەو کات بەراوردم لە نێوانی ڕابردووو ئێستادا دەکردو کاتێکیش بیرم لە داهاتوو لە بەرنامە دۆزەخییەکانیی داگیرکەران دەکردەوەو دەمهێنایە بەرچاوەکانی خۆم کە ڕەوە حوشترێك لەو تەلانەی ئەو بەرمان دەکەنو دەکۆشن ناتوانن تەنانەت بۆ هەڵلوشینی ئەو پووشە ڕەنگ زێڕینو ناسکەش هەنگاوێك بەرەو هەورازەکە باوێنو چەند عارەبێکیش بە دەستێك دیشداشەکانیان هەڵکردووەو بە دەستەکانی دیشیان عەگالەکانیان گرتبوون تا لەگەڵ هەڵقوزینەوەو لێخوڕینی حوشترەکانیان لەسەریان نەکەونە خوارەوە ...!

- براینە تا زووە بگەڕێنەوە بیابانی خۆتان ، چونکە نە خۆتانو نە حوشترەکانتان لەم نیشتمانەی ئێمەدا هەڵناکەن !

ئەو دیمەنەم دەهاتە بەر چاوو لە هەمان کاتدا بیریشم لە ڕۆژگارێکی دی دەکردەوەو تروسکاییەکی ئومێد لە دەروونەوە مژدەی ئەوەی پێ دەدام کە ئەم گەلەی ئێمە هەرگیزاو هەرگیز دەست بەرداری نیشتمانەکەی خۆی نابیو ڕۆژێك لە ڕۆژان هەر دەیسەنێتەوە .

گەڕامەوە لای هەڤالانو سەیرمانکرد نانو پێخۆرێکی زۆر کەممان ماوەو نەشدەبوو تا دەگەینە ئاوەدانیەك لە خۆمانی ببڕێنین ، چونکە هێشتا ئەگەری زۆر پێشهاتمان لە پێشدا بوون.

لە دوڕ چەمەکە تاقە دار سێوێکم دۆزیەوە، لەبەر کارکە سێوان داهاتبروەوەو ویستمان بە بەری ئەو تاقە دار سێوە ، بێ نازە ، زەرد هەڵگەڕاوە چاری ژەمە خواردنێك بکەین . بنە سێوەکە لە ڕۆخی ڕووبارەکەدا سێبەری چیای سەربارو شنە شنی ئەو دار

بەرووانە دەیانلاواندەوە کە ئەم بەرو ئەو بەری دۆڵەکەیان تەنی بـــوو . دار ســێوەکەش گەواهیدەرێکـــی مـــێژووی ســـەردەمی کیمیابارانکردن بوو ، بۆیە ڕەنگ زەرد ، هەر ئەوەتا خۆی بە پـێوە گـرتبوو ، بـە ئومـێدی گەڕانـەوەی خاوەنەکانـی ڕوو لـە ئاسمان‌و لە حاڵەتی پاڕانەوەو نزا چاوەڕوان بوو .

بۆنی یەکەم سێوی ناو لەپی دەستم بۆ دوو ڕۆژگاریان بردمەوە ، کە تەنانەت وە بیرهاتنەوەشیان ترازیدیایەکی دەروونی بـوون : ڕۆژگارێـك بـەردەوام فڕۆکەکانـی دوژمـن ئـەو گـوندەیان بۆردومان دەکردو منیش لە سایەی شەڕی داگیرکەراندا ڕۆژەکانی منداڵیتـی خـۆم بەســەر دەبردو ڕەنگە جارێك لە جارانیش لە سەر هـەمان دار سـێو بـوو بم کـە گـوندەکە کەوتـۆتە ژێـر ڕەحمەتـی بۆردومانـێك‌و ڕۆژگارێکـیش: کـە بۆنـی ((سـێو)) ئـەم گەلـەی قڕەکـردو دارو درەخـت‌و گـوڵ‌و کـورپەڵ‌و گیاو باڵـندەو ئـاژەڵ‌و هەمـوو شـتێکی زینـدووی دەکوشـت. بۆنـی ئـەو سێوە لە هەواری خاڵـی‌و جـێگای تـرس‌و گەمانـی ســەردەمێکی منداڵـیم بـۆ ئـەو ڕۆژگـارەی دەبـردمەوە کـە داگیرکـەران بـۆ تەفـرەدان‌و فریودانـی منالانـی کـوردو بگـرە باڵـندەکانی کوردسـتانیش بۆنی بەهەشتیی سـێویان دەکـردە ژەهـرو گـازی قـڕان‌و هـەر لـەوێش بـەو بـۆنە چەندین مناڵی پەپولەو ژن‌و پیاوی بێ گوناحی پێ خنکێندران‌و تا هەنگینێ‌و ئێستاشی لەگەڵدابێ دەیان کەس بە ئاسەواری هەمان بۆنـی ســاختە دەتلێـنەوەو لەگـەڵ هــەر کـۆکەیەك‌و هەناســە هەڵکێشانێك برینەکانیان قووڵتر‌و ئازارەکانیان زیاتر بوون‌و دەبن‌و ناوەخت پێی بەرەو پیری مەرگ چوون‌و دەچن .

لەوێ،بەهەسـتی ناسـك‌و لـە نـاو یـادەوەری‌و ئەندێشـە فـریوەکەمدا دار سێوەکە پێـی گـوتم: منـیش لەبـەردەم بارەگـای

خـوادا .. لەبـەردەم ئاهـو هەناسـەی پەرەسـێلکە مـێلانە وێرانەکاندا.. لەبەردەم دادگای مرۆڤایەتی دا.. لەبەردەم هەموو دڵێك کە بەزەیی و خۆشەویستی تێدا بێ .. لەبەردەم هەموو کەللە سەرێك کە مێشکی مرۆڤی تێدابێ .. لەبەردەم هەمووان سکاڵام هەیە ؛ چونکە رەگەزی منیش وەك رەگەزی خاوەنەکانم بەو بۆنە مردن کە لەمنیان دزیبوو !. ئەوەتا هێشتا پاشماوەی ئەو گازەی تێکەڵ لە بۆنی من بوو لە ناو رەگو قەدەکانمدا ماوەو هەڵگیراوە .. من نەك هەر لەسەر ئەوە سکاڵام هەیە کە خۆم بەر ئەو ژەهرە کەوتم ، بەڵکو بگرە لەسەر ئەوەش سکاڵام هەیە کە ناوو ناوبانگی پڕ لە خۆشەویستیی و پڕ لە تامو سوودو پڕ لە جوانیی منیان زڕاندو بەو بۆنەی من منداڵو باڵندەو پەپولەیان بۆ مردن فریودان !.. منێك کە بۆ جوانیی و خۆشەویستی و سوودمەندی ڕسکاوم .. منێك کە ئاژەڵو باڵندەو مرۆڤیش هەرگیز لە بۆن و رەنگو بەرەکەم وەڕس نابن ، منێك کە لەگەڵ رووباردا لە خۆشەویستییەکی هەتا هەتاییدام .. منێك کە تەنانەت کیژان بەوە خۆشحاڵ دەبن مەمکەکانیان بە بەری من بچوێندرێ ، ئەو مەمکانەی چاوگی ژیان و خۆشەویستیی مرۆڤن !....من ئەوە بووم !

کەچی ، ئەوان بە بۆنی لەمن دزراوو ژەهری خۆیان.. تاوانیان کرد.. تاوان.. تاوانێك کە هەر درێژەی هەیەو تادێش کاریگەرتر دەبێ و کۆتایی نایەت !

لەو کەشەو لە ناو تابلۆی حیکایەتێکی ئەفسانەییدا پڕ بە جەمادانیەك سێومان لێ کردنەوەو بردمان قاش قاشمانکردن و لە کۆنە مەنجەڵێکدا کە هەر لەوێ دۆزیمانەوە (کە بێگومان مەنجەڵەکەش چیرۆکێکی خۆی هەبوو) کوڵاندمان و دواتریش دوو

قوتــوە گۆشــتمان تێکــردنو مزەورەیەکــی نایابــی ســێوانمان دروستکردو خواردمان ، هەرچەندە خواردنەکە هەر بەری گەدەی دەگرت ، بەڵام چار نەبوو ، نەبوو لەوە زیاتری بخۆین .

* * * * *

دوای نیوەڕۆ بوو لە ژێر قاپی دارگوێزێك بە تەنیا ڕاکشابووم‌و سەرنجی ئەو دیمەنە جوانانەی وڵاتی بێ هاوڵاتیم دەدا ، لە پڕ ڕێویەکی گەڕی بچکۆلەم بەر چاو کەوت . سەرەتا وامزانی هەر من ببینێ ڕادەکات ، بەڵام بە پێچەوانەوە تا دەهات نزیکتر دەکەوتەوە ! منیش سەیرم دەکردو سەرنجم دەدا داخوا ڕێویەکە بۆچی لە مرۆڤ ناترسێ ؟ تۆ بڵێی دوای وێرانکردنی گوندەکەو ڕاگوازتنی خەڵکەکەی لە دایك بووبێ‌و مرۆڤی هەر نەدیبێ ، یان لە بێ هێزی‌و لاوازی لە خۆی وەڕسە ؟ تۆ بڵێی ئەویش بزانێ ئێمە پێشمەرگەین‌و بۆنی کردووین هاتۆتە بەخێر هاتنەوەمان ! یاخود مەبەستێکی تری هەیە ؟ هەر چۆنێ بێ ڕێویەکە وردە وردە لەو ناوە بە دوای خواردنێکدا دەگەڕا . هەر لەو کاتیشدا هەڤاڵ فەرهاد بەرەو لای من هات‌و منیش بە خۆم نەبوو هەر چاوم پێکەوت یەکسەر پێکەنینم هات ، کەچی فەرهاد گوتی : ئەرێ ئەمن چیم لێ هاتووەو دەم‌و چاوم چۆنن ؟

فەرهاد بە هۆی تیشکی خۆرو هەوای کوێستان و ماندوێتی‌و نەخۆشیەکەشی هەم زۆر لاواز بوو بوو ، هەم دەم‌و چاویشی توێکڵی هەڵدابوو . لەو کاتەدا ڕێك وەکو ڕێویەکەم هاتە بەر چاو، بۆیە بە پێکەنین وەڵامم دایەوەو گوتم : بە خوا چی بڵێم وەك ئەو ڕێویەت لێ هاتووە کە تازە لێرە بوو !

هــەر ئەوەنــدەم گــوتو فــەرهاد تــووڕە بــوو، هــەڤاڵ موحسینیش کە زۆر گاڵتەچی و قۆشمە بوو هێندەی تر ئاگرەکەی خۆش کردو ئیدی ناوە ناوەش دەیگوت :

- ڕێوی ! وەڵڵا برا باش کردتە ڕێویش ! .

لەوێ موحسین مەزەیەکی باشی سوعبەتی بۆ پەیدا بوو .

* * * * *

ئێوارە بە ڕێکەوتینو کە لە ڕێگای دەرەدار بەرەو دۆڵی بالیسان سەردەکەوتین ئاگام لێ بوو هەڤاڵ فەرهاد بە هەڤاڵ موحسینی دەگوت :

– زۆرمان نەماوە بگەینە ئاوەدانیو بچینە ماڵی مام ڕەمەزانی برادەرم تا تێر تێر بخۆینو بخەوین .

لەسەر دەرەدار بەرامبەر بە دۆڵی بالیسان چاوەڕوانی خۆرئاوا بوونمان دەکرد تا بەو ڕێگایەدا شۆڕبینەوە کە کابرا لە بنەوەڕا تەلاقی خواردبوو کە هەرگیز ڕێگە بە قەد ئەو شاخە عاسیو هەڵدێرەدا سەرناکەوێ !

ئێوارەیەکی فێنك بوو ، ئێمەش لە ژێر سێبەری داربەڕوو ، کەوەت ، مازی ، دیدارانـدا دانیشـتبووینو هەریەکـەو باسـی مـرازێكو ئاواتێکی خۆمان دەکرد . هی وا هەبوو دەیگوت : تێر تێر بنووستبام . هی وا هەبوو دەیگوت : گەیشتبامەوە شەقڵاوە. زۆربەشمان دەمانگوت : ڕۆژێك هاتبا بەسەر بەرزی بەو جادەیەی دۆڵی بالیساندا ڕەتبووباین .... ئەوانە هەمووی خۆزگەو ئاواتی زۆر گەورەو دوورە دەستو مەحاڵی ئەو کاتە بوون .

* * * * *

خۆرئاوا لە پێچەکانی دەرەدار شۆڕبووینەوە ، لەوێ زیاتر هەستمان بە گەورەییو دڵسۆزیی و شارەزایی باوو باپیرانی

خۆمان دەکردو سەرمان لەو وەستاییەی ئەوان سوڕ دەما کە چۆن توانیویانە لە ناو ئەو شاخە سەختەدا بەو شێوە ئەندازەییە ڕێگای هاتوچۆی نێوان هەردوو دۆڵی مەلەکان و بالیسان بکەنەوە ! کەچی ئێستاش نەوەکانیان نەك خاوەنی ئەو ڕێگاو بانانە نین ، بەلکو لای ئەو بێگانانەی نیشتمانەکەمانیان داگیر کردووە لە تلیاك و میرۆیین قاچاغترن! ئای ستەم تۆ لە کەنگێوە سەرت هەڵداو کەی کۆتاییت پێ دێ؟

بە تاریکایی شەو ، بەو شوێنەدا واتە شێخ وەساناندا ڕەتبووین کە بۆ یەکەم جار بەر بۆردومانی گازی کیمیایی کەوت و خەلکەکەی بە گەورەو بچووکەوە ، بە ژن و منالەوە یان مردن ، یان گیانیان هەلا هەلا بوو .

دەوروبەری جادەکەی دۆڵی بالیسان هەمووی ڕەبایەی جاش و سوپا بوو. لەبەر ئەوەی زووتر نەهاتبووین و شوێنی ڕەبایەکانمان بە تەواوی نەدەزانی، هەندێك درەنگ لە جادەکە پەڕینەوەو چووینە سەر کانی بێ شێخێ کە لە بناری چیای هەوریێو بەرامبەر بە بالیسانە .

هەرچەندە کانییەکە لە ڕەبایەکانی سەرجادەو فەوجە سەربازییەکەی بەر بالیسانیش زۆر نزیك تەنانەت لە حوکمی کلاشینکوف بوو ، بەلام پەناش بوو . دامانتا پشوویەك بدەین ئەوجا بە کاوەخۆ بڕۆین . دوای قاچ و دەم و چاو شووشتن پالماندایەوە گوایە سەر خەوێك دەشکێنین و هەلدەستینەوە .

* * * * *

بەلام ،کاتێك بە ئاگا هاتینەوە خۆر سێ گوریسان لە لوتکە هەرە بەرزەکان هەلکشابوو! . ئیدی بە پەلەپەل و هەناسە بڕکێوە ، هاتکە هاتك بە ناچاری بەو ڕۆژە ڕووناکە لە ناو گەلی

بێشێخێ ملی هەورازی کڵاو قاسمەمان گرتە بەرو بۆ ئەوەی بە تەواوی نەکەوینە بەرامبەر چاوی دوژمنان لە پەنای دارو درەختو نزمایی و تەنیشت بەردانـدا دەڕۆیشـتین . بـەم ڕەنگـە تـا نەگەیشتینە سەر لوتکەی بەرزو قوچەکی کڵاوقاسم ڕانەوەستاین ، چونکە ئەگەر پێش ئەوێ تووش بووباین ئەوا بێگومان خراپمان بەسەر دەهات ، بەڵام ئەوێ جێگای شەڕو دەستوەکەر کردن بوو.

کۆنە پۆستاڵو خودەو شتی تری سەربازی لەو جۆرەی سـەری کـڵاو قاسـم ، مـێژووی دوورو درێـژی داگـیر کردنـی وڵاتەکەمانیان دەگێڕایەوەو نیشان دەدا .

– تا شەو لێرە بین ، یان بڕۆین !

– خۆ دوژمن لە سەر ئەم شاخە بە زەردکانو شاخی سۆریشەوە نیە ؟

– وایە .

– ئەدی بۆ سەبر سەبرە نەجووڵێین و نزیکتر نەکەوینەوە !

–باشە با بڕۆین .

*  *  *  *  *

لەسـەر ئەو چیا بەرزە ، بەرامبەر بە هەردوو دۆڵی بالیسانو هیران بە ئاراستەی شەقڵاوەدا دەڕۆیشتین . نوێژی نیوەڕۆ بوو ، لەسەر ئـەو چیا وشکو بـرینگو بڵند دەڕۆیشـتین، لـە گوندەکانی دۆڵی بالیسـانیش جگـە لـە مۆڵگەکانـی دوژمـن زیاتـر شـتێکی تـر بەدی نەدەکرا . لـەو هەمـوو گـوندانە نـەك هەر تاکە خانوویەك بە پێوە نەمابـوو ، بەڵکـو تـەوای ڕەزو باخەکانـیش سووتابوونو وشك بوو بوون.

– ئای ! لەو کارەساتەی لە دوورەوەڕا دەبیندرا .

نیسان بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیم کە ماوەیەکیش لەو نۆڵەدا بەسەرم برد بوو هورووژمیان هێنایەوەو لە پڕ لە کاتو شوێن دابڕام .

لەگەڵ منداڵە برادەرەکانم گەمەی باز بازێنمان دەکرد ، هەموو برادەرەکانم بازیانداو نۆرە هاتە سەر من : دەی تۆی ؟ باشەو هووپ خۆم هەڵداو بازمدا .. هەر ئەوەندەم زانی کەوتمە ناو تەڕاشێکو خەریک بوو لەبەر ئازاری قاچەکەم ببوورێمەوە !.

- چی بوو ؟

- هیچ هەر لەبەر ئازاری قاچم خۆم پێ نەگیرایەوەو بەربوومەوە !

بەهەرچی حاڵێك بوو هەستامەوەو بێ ئەوەی بەسەرهاتەکەم ئاشکرا بکەم لە دوای هەڤاڵانەوە درێژەم بە ڕۆیشتندا. سەیری ئەو بەرم دەکرد لەبەرامبەر گوندی خەتێدا ئاگام لە خۆم بڕایەوەو جارێکی تر کەوتمەوە دوو چاڵێكو قاچم هێندەی تر جۆشی ئازاری سەند ...

لەو جێگایەی لێیکەوتم بڕکە کنێرێکی وشك هەڵاتووم نیت، هەڵمگرتەوەو تێرتێر بۆنم کرد، بەدیتنو بۆنکردنی کنێرە وشکهەڵاتووەکە، بیرەوەرییەکی چیرۆکئامێزم هاتەوە پێشچاو. بەراستی بیرەوەرییەکان، ناخ هەژێنو فرەهەستیار بوون، خۆڕا نییە مام هێمن هەواری خاڵیو وەلی دێوانەش کێلی بەقەد باڵای شەمیان نووسیوە؟

کنێر .. ئەو دەڤەرە بەهاران بەسەوزی گەڵاو زەردی کوریکەو بۆنی بەهەشتیی کنێران دەرازێتەوە. بەهاری حەفتاو پێنج بوو کاتێك باوکم لەبەرەی شەڕی ئاشبەتاڵ پێکراو گەڕایەوە لامان لەگەرمەسێری خوزستان چەپکێ کنێری ئەو دەڤەرەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، بەشێوەیەك هەڵیگرتبوو کە تێك نەچێو

هەڵنەوەرێ .. لامان سەیر بوو باوکم هێندە بایەخی بەو چەپکە کنێرە دەدا بۆیە لێمان پرسی :

بابە..ئەو چەپکە کنێرە بۆچی هێندە لای تۆ خۆشەویستە؟

باوکم گوتی چونکە کە خواحافیزیم لەدایکم کردوو،ویستم بەرەو ئێرە بگەڕێمەوە ئەو.. ئەو چەپکە کنێرەی دامیّو پێی گوتم بۆ منداڵەکانت ببە.

-ئەدی بۆچی نایدەی بە ئێمە؟

-چونکە لەوکاتەی لەدایکم ئاوابووم تا ئێستاشی لەگەڵدابێ هەرچەند جارێك بۆنی دەکەم، دایکم دێتەوە بەرچاوم، هەرچەند جارێك بۆنی دەکەم بەئەندێشە دەگەڕێمەوە نیشتیمان.. ئەو چەپکە کنێرە بۆنی دایكو بۆنی نیشتیمانم، بۆنی ناوچەکەمانی لێدێو رەنگی کوردستانی پێوەیە.

ئەو کات لەوێ باوکم بەبۆنو رەنگی کنێری ئێرە سەبووری دەهاتو ئێستاش بڕکە کنێرێکی وشك بووی ئێرە ئۆقرەی لێ بڕیومو بەرەو ئەوێم دەباتەوە. بێگومان هەر گەلێك نیشتیمانێکی هەیە، لەهەر نیشتیمانێك سەدان نهێنی هەیە، کلیلی هەر نهێنیەکیش لای گەلەکە خۆیەتیو نەداگیرکەرو نەبیانیو نەهیچ میوانێکیش پەی پێدەبەن، نهێنیەکی منیش لەو نیشتیمانە کنێرەو .. کنێریش بیرەوەری نیشتیمانو ئاوارەییو دایکمونەنكو باوکمو بەهارە.

دەرفەتی جووڵەمان سنووردار بوو ، هەروەها دیتنی دیمەنە کاریگەرەکانی کاول بوونی نیشتیمانەکەمانو تەنیاییش هێندەی تر کاریگەر بوون ، بۆیە لەو کاتو شوێنە ناسکەدا پانتایی ڕابردوو زیاتر باڵی خۆی بەسەر ئاسۆی بیرو بەر چاواندا دەکێشاو،

بێگومانـیش ناخۆشـترین بەسـەرهاتی ژیـان کاریگەرتـرین‌و ناخبـزوێنترین یـادەوەری تـۆمار دەکـەن . هـەر بۆیەشـە لەسـەر پاشمـاوەی تراژیدیاکانی نیشتماندا هەموو سەرنجەکان،دیمەنەکان ، تامـەکان، بـۆنەکان ، ئازارەکـان ، هەناسـەکان ، هـەنگاوەکان ، هـەورازەکان، نشـێوەکان ، .. بۆ رابردوویان دەگێڕامەوەو، هەر دەبـوو واشـبێ ، چـونکە دیمەنـەکان، ڕەنگـەکان، گـوندەکان ،ڕێگاکـان هەمـوو شـتێکی نیشتمانەکەم گۆڕابـوون‌و هـی جـاران نەبوون . دیارە گۆڕانیش لە نێوانی یادەوەری‌و هەلومەرجی ئاوادا دوو سـەردەمی جـیاوازی لـە پـێش چـاوان نیشـان دەدان‌و وێـنە دەکێشـان . وێنەکانـیش زیاتـریان بـە ڕابـردوو دەبەسـتمەوەو بەراوردەکـەش جیاوازی نـێوان ستەمی سەر گەلەکەم‌و مافەکانی نیشـان دەدام کـە مەودایەکـی گەلـەك گەلـەك دوورو درێـژیان لـە نێواندا دەبیندرا .

هـەروا لەسـەر چیای زەردکان لە دوای هەڵاڵەنەوە بە شەلە شەل دەڕۆیشتم‌و چاوێکیشم هـەر لـەلای ئەو سەدان باخە سووتاوانەی گوندی خـەتێ بوو . لە ژێر سێبەری پیرە دار گوێزێکی ناو باخێك لـەو سـەدان باخـە سـووتاوو هیشـك بـووانە مەھـۆی بـرام لـە دایك بوو.هێشـتا دوو بـەهاری تەمەنـی تێنەپەڕاندبوو کە بەهۆی زەبرو زەنگـی داگیرکـەران ناچـار بـووین ڕێگـای ئاوارەیـی بگـرینە بـەرو بڕۆین،بڕۆین تـا لـە ناوچـەی خوزسـتانی ئێـران لـە ژێـر چادرێکی شـێرو خورشـید گیرسـاینەوە .هـەر لـەو سـاتەی پـێمان وەنـاو خێوەتەکە نـا بـرا بچووکەکەم گریا.. گریاو بـە هـیچ شـتێك ژێر نەبـووەوە . بـردمانە لای دکـتۆرو دکـتۆریش هـیچ نیشـانەیەکی نەخۆشـی لێ نەدۆزیـەوە، بـۆیە هێـنامانەوە، بـەڵام ئـەو هەرکـە سـەیری خـێوەتەکەی دەکردو هۆڕ هۆڕ دەگریا . ئینجا مانیشی لە

خواردن گرت . به هەموو شێوەکمان دواند تا بە هەرچی حاڵێك بوو گوتی : (ماڵێ !) بە دووبارە کردنەوەی وشەی ماڵێ تێگەیشتین کە ئەو بەو هەوارە قایل نیەو نیشتمانی خۆی دەوێتەوە،بەڵام ئەو ماڵە بۆ ئەو لە کوێ بێنین؟

ئێمەی ئاوارە لەسەر باڵەکانی کاتدا دەڕۆیشتین‌و لە شوێنی خۆماندا هەڵکەنابووین، مەمۆش لە نیشتمانی خەڵکی تردا ئۆقرەی نەدەگرت‌و بۆ نیشتمانەکەی خۆی دەگریاو مانی لە خواردن دەگرت و بە وشەی ماڵێ ....ماڵێ هەست‌و سۆزێکی وەهای دەردەبڕی ئێمەشی دەهێنایە گریان . ماڵ‌و نیشتمانی ئەو منداڵە بچووکە یەکێك بوو لەو باخە سووتاوانە،بەڵام نیشتمانی ئێمەی هەراش‌و فام کردە کوردستانێکی گەورە بوو، بۆیە دەبوو بە قەد ئەو گەورەییە هەست‌و سۆزی خۆمانی بۆ دەربڕین‌و هەر لەو پێناوەشدا باوکمان لەوێ لە بەرەکانی شەڕدا بەجێمابوو . لەوێ گریان‌و برسێتی خەریك بوو جەستە لاوازەکەی مەمۆ وشك بکەنەوە،کەچی ئەو گڕنەگەی لە (نیشتمان) گرتبوو . بە دوای ڕێگا چارەیەکدا دەگەڕاین‌و باشترین خواردنمان دەخستە بەردەم‌و درۆمان لەگەڵ دەکرد،بەڵام کەڵکی نەبوو . ئەو هەر کە چاوی هەڵدەبڕین‌و خێوەتەکانی دەدیتن دیسان لە پرمەی گریانی دەدایەوە،دراوسێکانمان بەو مەسەلەیان زانی‌و ئەوانیش هەستی سۆزو غوربەتیان دەجوولاو دەگریان .

لە دووری ئۆردوگاکە لە گوندێك هەندێ داری یوکالیپتۆز دیار بوون‌و بیرمان کردەوە کە ئەو درەختانەی نیشان بدەین‌و پێی بڵێین ئەوێ ماڵی ئێمەیە . بردمان لە ئۆردیگاکەمان دوور کردەوەو بەرامبەر بە گوندەکە دانیشتین‌و خواردنمان دایەو پێمان گوت دوای نان خواردن دەچینەوە ماڵی خۆمان . ئەو بەو فێڵە دەستی

لە مانگرتنو گریانەکەی هەلگرتو بە مەرج نانو ماستەکەی خوارد. هەر پارووبەکی قووت دەداو سەیرێکی درەختە دوورەکانی دەکردو لە خەنیی خۆشیان دەگرنژیەوە .بەم شێوەیە تا لەگەڵ ئاوهەوای نیشتمانی نوێ راهات دەبوو هەموو ژەمێك بیبەینە بەرامبەر گوندی سەگوانو نانی دەرخوارد بدەین ! تا وای لێهات خووی بەم کارەوە گرت . جا ئەگەر ئەو بەو تەمەنە لەرێ وەها بووبێ،ئەدی گەلۆ ئێمە کە ئێستا لە دوای دوو شۆڕشی بێ ئاکام لە ئاوارەیی دەگەڕێینەوەو نیشتمانی خۆمان بەو رەنگە دەبینین چ هەستێك لە دڵو دەروونماندا دەبووژێتەوە ؟

لە هیکڕا دەنگی دوو فڕۆکەی جەنگی لە شوێنی خۆمانیان چەقاندینو لە هەمان ساتدا هاڕەی ئەو دوو فڕۆکانە ئەو ئازارەی سەر شەپکە پیلی لای راستەمیان ژیاندەوە کە چەندین ساڵ زووتر بەرامبەر بە هەمان شوێنو لە ناو باخێکی گوندی خەتێ دا بە هەمان ئاواز بە بەر بۆردومانەکانیان کەوتبوومو لە پێش چاوانیشمدا حاجی حسێن پارچە پارچەو نافیعەش سینگی شەقار شەقار بوو و شەهید بوون .

فڕۆکەکان چەندین جاری تر بە بەرزیو بە نزمی هاتنو چوونو لوت بەرزانە تەراتێنیان لەو ئاسمانە دەکرد کە خاکەکەی ژێریان سوتماك کرابوو ، بەلام زوو تێگەیشتین کە هاڕەی فڕۆکە، دیمەنە دوورە دەستەکان، تاسەی دووری، ئۆخەی دیتنەوەی کۆنە هەوار، بەلام هەناسەی ساردی هەواری خاڵی .. نیشتیمانی خاڵی جگە لە هەلقرچانی دڵو دەروونو بیرەوەرییە تاڵو شیرینەکان هیچی تریان نەدەگەیاند.. دەنگی فڕۆکە هەر ئازار نا، بەڵکو کانی پێکەنینی رووداوێکی بەسەرچووی ئەو گوندەی بەرامبەرمی تەقاندنەوە.. پێکەنین لەکاتە ناهەموارەکان لەیەك کاتدا هەم

خۆشی‌و هەم نیگەرانی دەگەیەنێ، پێکەنین بۆ زاڵ بوون بەسەر نیگەرانی یان، حاڵەتێکی هستریایی بوو؟!
–ساڵی حەفتاو چوار فڕۆکەکانی داگیرکەران زۆر بەسەختی ئەو گوندەی بەرامبەرمیان بۆردومان کرد.. لەبەر زەبری تەقینەوەو پارچە بۆمباکان گوێزو هەناری گوندییەکان وەك تەرزەی بەهار لەدرەختەکان دەبنەوەو هەڵدەوەرن، لەو کاتەدا هەنارێکی رزیو بەپشتی ئەو مام حەمەدە دەکەوێ کە خۆی لەژێر بنە هانەرکە مات کردبوو.. مام حەمەد نەختێك ئازاری پێدەگاتو دەستی بۆ پشتی دەباتەوەو هەست دەکات دەستی تەڕ بوو، لەو تەنگاویەو بێ دادییە کابرا سەیری دەستی خۆی دەکاتو دەبینێ خوێنی پێوەیە، خوێن، چ خوێن رش‌و مەیوو بۆیە یەکسەر هاواری ژنەکەی دەکاتو دەڵێ:
ژنەکە فریام کەوە جەرگم لەپشتێدا هاتە دەرێ!
کاتێکیش ژنەکە بەهەڵەداوان خۆی دەگەیەنێتێ‌و دەبینێ هەناری بەرپشت کەوتووە، لەژێر سێبەری مەرگ‌و رەحمەتی بۆمبا لەتریقەی پێکەنین دەداو دەڵێ:
–هەستە پیاوەکە ئەوە هەنارە بە پشتت کەوتووە !
دەمانزانی فڕۆکەکان مەبەستیان ئێمە نیەو ، هێشتاش دوژمن بە گەرانەوەی نەزانیبووین.
دۆت مەلا قورئانێکی لە نێوان خۆی‌و ئەو سوختەیە دانابوو کە بە پەلە دارێکی باریك‌و درێژ وشەکانی نیشانە دەکردن‌و بە چەند جارێك خوێندنەوەو دووبارەکردنەوە بە سوختەکەی رەوان دەکردن . ئێمەش چەند سوختەیەکی تر چاوەڕوانی نۆرەی خۆمان دەکرد ، من کە لە لای خوارەوە ئاقڵ دانیشتبووم‌و چاوەکانم بڕیبوونە دەستە لاوازو پڕ لۆچەکانی دۆت مەلا و

گوێکانیشم لەو وشە عارەبیە گران‌و زەحمەتانە قۆراغ کردبوو کە هەموو جارێ رنگەیان لە ناو مێشکمەوە دەهێنا . نازانم داخوا دۆت مەلا سەرمای بوو بوو یاخود،هەر خۆی چڵمن بوو! لە پڕ هەردوو پەنجەی گەورەو شایەدمانی دەستی ڕاستەی وەك گیرە لە کەپووە درێژو ڕەقەکەی گیر کردن‌و لەگەڵ فننەیەکی قووڵ‌و بەهێزدا پڕ بەناو لەپی دەستی چڵمێکی شین‌و جیڕی هێنایە دەرێ‌و بۆ ئەوەی خۆشی لێی ڕزگار بکات دەستەکەی بەرز کردەوەو ڕایوەشاندو شریخەی لە نێو چاوانی منەوە هێنا. چڵمەکە بەسەر دەم‌و چاومدا هاتە خوارێ‌و من یەکسەر تاسام‌و، ئەویش بە پەلە پەل هەستایەوەو بەرەو لای من غاریداو بە :
—هەی چاوی دایکت کوێر بێ ! هەی دەستی داکت بشکێ بە لیفکە چارۆگە ڕەشەکەی دەم‌و چاوی سڕیمەوە،بەڵام من پێم وابوو هێندە پیس‌و نیگەرانیش بووم بە هیچ شتێك جەستەم پاك‌و ناخم هێور نەدەبوونەوەو تریقۆنی پێکەنینی منداڵەکانیش خەریك بوو بە ناخی زەویمدا بیەنە خوارێ . دۆت مەلا خۆی تووڕە کردو ئەوان بێ دەنگ بوون‌و منیش دانم بە خۆمدا گرت تا ئەو دەرسەشم خوێند،بەڵام کە گەڕامەوە ماڵەوە چۆنم قورئانەکە دانایە سەر ڕەفەکە جار ئەو جار بوو بۆ خوێندن دەستم پێ‌ی نەکەوتەوە .
دەڕۆیشتم‌و زایەڵەی بیرەوەریەکان لە هزرو دڵدا جێگەی خۆیان دەگرت . لە خۆم دەپرسی: باشە ئەگەر ئەم ڕووداوە نەبوایە کێ دەڵێ لە جیاتی ئەوەی لە هەنداو چیای زەردکان بە پارتیزانی دیمەنە دووراو دوورەکان بەرەو مێژووی بیرەوەریەکانم ببەنەوەو بۆ ئامانجێکی پیرۆزی دنیایی هەنگاو بنێم،ئێستا کۆلکە مەلایەك نەدەبووم ڕۆژ تا ئێوارە بە گێڕانەوەی چیرۆك‌و مێژووو

ئەفسانەکانی نەتەوەیەکی تر بۆ ئامانجی ئەو دنیا( قیامەت ) خەریك نەدەبووم؟
سەرم هەڵبڕیو چاوەکانم بڕینە چیای کورەكو پێیدا هاتمە خوارەوە ، هەموو دۆڵی ئارانەم بە چاوان کێڵان تا بینایی چاوەکانم لەسەر قوتابخانەی گوندی ئارانە گیرسانەوە . ڕووداوێك بوو بە هۆی ئەوەی لە قوتابخانەی ئارانە ڕا بکەمو بۆ قەرەبوو کردنەوەی خوێندنەکەم پەنا بۆ دۆت مەلای خەتێ ببەم .
بەیانی ڕۆژێکی ساردی زستان بوو،مامۆستا ناوی منیشی خوێندەوەو منیش لە سەرمانو لە شەرمان لەسەرەخۆ وەڵامم دایەوەو گوتم : بەڵێ . دیار بوو دەنگی بەڵێ نەگەیشتبووە گوێی مامۆستا،بۆیە گوتی :
-چت گۆ ؟
پێش ئەوەی من دەنگم هەڵبڕم سەباح لەولاوە گوتی : مامۆستا گوتی هۆ !
سەرەڕای ئەوەی وشەی هۆ سزای قورسی بەسەرەوە بوو، وەڵامەکەی سەباحیش بوختانێکی هەندە گەورە بوو دایچڵەکاندم . ئەگەر یەکەم جاریش نەبووبێ کە گوێم لە درۆیەك یان بوختانێك بووبێ ئەوا بێگومان یەکەم جار بوو بە هۆیەوە ڕوو بەڕووی لێپرسینەوەو سزا ببم . ئاوڕێکم لە سەباح دایەوە هەرنا بۆ ئەوەی بە چاوان پێی بڵێم کە بۆچی ئەو درۆیەت کرد! بەڵام،پێش ئەوە مامۆستا بانگی لای تەختە ڕەشەکەی کردمو یەکسەر گوتی : دەستەکانت بکەوە !
دەستە سڕبووەکانم بە ترسەوە کردنەوەو مامۆستا دوو داری لەم دەستو دووی دی لەو دەست دام .ئازاری دارکاریکردنەکەو ئازاری بوختانەکە ژێیەکانی دەنگمیان خاوکردنەوەو خۆم پێ

نەگیراو گریام . مامۆستا تورەتر بوو گوتی : ئەوە دەگری ؟ دەی بیسان دەستەکانت بکەوە ! دەستەکانم کردنەوەو ئەمجارەش دوو داری تری تێ سرەواندن‌و ویستم ئەمجارە پێبکەنم،بەلام نەمتوانی‌ودەنگێك لە نێوانی گریان‌و پێکەنیندا لە زارم دەرچوو،نازانم ناوی چی لەو دەنگەی ئەو حاڵەتە بنێم! لەسەر ئەوەش دوو داری ترم خواردو گوتی : دەبڕۆ جارێکی تر نەڵێی هۆ !

ئەی خودایە مامۆستا لەسەر هۆیەك کە نەمگوتووە وام لێدەکات ئەدی ئەگەر هەڵەیەك بکەم چیم بەسەر دێنێ ! لە ناو ئازارو سەرما دەستەکانم خستنە ناو گەڵم‌و چوومەوە سەر تەنەکەکەم، نەوێرام سەیرێکی سەباح بکەم‌و لێی بپرسم داخوا بۆچی بەو دەردەی بردم.

مامۆستا ویستی دەست بە دەرس گوتنەوە بکاتەوە هاوڕێیەکم گوتی : مامۆستا ! مامۆستا ئەو گوتی بەرێ نەیگو هۆ ! مامۆستا تەباشیرێکی ڕاوەشاندە قوتابییەکەو گوتی : سەباح درۆیان ناکات .

بۆ بەیانییەکەی نەخۆش کەوتم‌و چەند ڕۆژێك لەسەر یەکتری نەچوومە مەکتەب‌و ڕامکردو چوومەوە خەتێ .نەنکم‌و دایکم گوتیان باوکت بزانێ دەتکوژێ . بەلام من گوێم پێ نەداو لە دڵی خۆمدا دەمگوت باوکم هەرچییەکم لێ بکات بە قەد مامۆستاکەم ئازارم نادات . دوای گفتوگۆیەکی زۆر لەسەر قسەی دایکم‌و نەنکم بڕیارمدا ئەو ساڵە بچمە لای مەلا قورئان بخوێنم،بەلام من لە جیاتی مەلا چوومە لای مەلاژن‌و ئەویش ئەو پەندەی بەسەر هێنام کە بە هۆیەوە دەستم لە قورئان خوێندنیش هەڵگرت،بەلام چ ئازاری لێدانی مامۆستاو چ چڵمەکەی داك مەلاژن کاریگەریان

لەسەرم هەرماو تا هەراشیش بووم بەردەوام باسی ئەو دارکارییە لە خۆراییەی مامۆستاکەم دەکردەوە،ئنجا زانیمو تێگەیشتم کە ئەو کات مامۆستاکە (سەرەڕای ئەوەی خۆی تەنیا دەرچووی شەشی سەرەتایی بوو بوو) تومەز حەزی لە خوشکی سەباح کردوەو بە تەمای هێنانی بووە ، بۆیەشە هەندە بە قسەی بیسمیل بوو،ئەویش متمانەو حەوجەیی مامۆستای بەم ڕەنگە بەکار دەهێنا. هەر لەو ڕۆژەی کە ئەو لێدانەم خوارد تا دواتر چوومە زانکۆش پرسیارێك لە مێشکمدا دەخولایەوە کە ئایا ئەو هەموو لێدانەی مامۆستا بۆچی؟ بەڵام،کاتێك بەهۆی کاری شۆڕشگێڕانەوە گیرامو کەوتمە ناو زیندانی فاشستەکانی بەغداو ڕووبەڕووی ئازارو ئەشکەنجە لە ڕادە بەدەرەکەیان بوومەوە خۆم بە خۆمم دەگوت : ڕەنگە ئەو لێدانەی ئەو کاتە بۆ ڕاهێنانو بەرگەگرتنی دوا ڕۆژ بووبن !

لە ناو هەستە ورووژاوەکاندا چیای زەردکانمان دەبڕیو لە پڕ ئاودیو بووین . دیمەنەکانی ئەو دیو لەبەر چاوان بزر بوونو شەقڵاوەو دەشتی هەریریش لاپەڕەیەکی تریان هەڵدایەوە .

*     *     *     *     *

هەر لەو شەوەی لە ناو ئاشقوڵکە کەوتم قاچەکەم هەر دەهێشا، بەڵام تا دەهات هێشانەکەی پتر دەبووو لەسەر چیای زەردکانیش گەیشتبووە ڕادەی لە ڕۆیین کەوتن . لە چالاییەك کە پێی دەگوترێ گوفەك بەرەو لای شەقڵاوە شۆڕبووینەوە وەفالان جەلالو محەمەد گوتیان :

– ئەشکەوتێك لە ناو قەدی چیاو لە ئاقاستی گەرەوان بەرامبەر بە شەقڵاوە ، شاوی تێدایەو دەچین لەوێ بێنێك دەدەینو ئێوارەش دوای خۆرئاوابوون شۆڕدەبینەوە ..

–خۆ لەوە باشتر نیە .

ئەشکەوتەکە دەروازەیەکی گەورەو کراوەی هەیەو ڕێك بەرامبەر بە شەقڵاوەو گەرووی میراوەیە . لە بن ساپیتانی ئەشکەوتەکە ئاوێك دڵۆپ دڵۆپ دێتە خوارێ و دەکەوێتە ناو مەرکەوێك کە بەدرێژایی هەزاران ساڵ بە زەبری ئەو دڵۆپە ئاوانە بە قەد جۆنییەك قووڵ بووەو هەمیشە پڕەو لە هەموو لایەکی چیاکەشەوە باڵندە جۆراو جۆرەکان بۆ شکاندنی تینوێتی خۆیان ڕووی تێ دەکەن . ئاوی ئەو ئەشکەوتە سوودو جوانییەکی زۆری بە ژیانی کێوی چیای زەردکان داوە چونکە هۆکارێکی باشی پاراستن‌و ڕاگرتنی هاوسەنگی ژینگەکەیە .

ڕۆژی هەژدەی تەموز بوو ، دنیا لەوە گەرمتر نەدەبوو ، ئێمەش بە ڕێگەوە هەموو ئاوی گیانمان کردبووە ئارەقەو ئەوپەڕی پێویستیمان بە ئاوێك هەبوو کە قەرەبووی ئاوی لە دەست چوومان بۆ بکاتەوەو تینوێتیشمان بشکێنێ . لەسەر چیایەکی وەها وشکیشدا لەو ئاوەمان چاکتر دەست نەدەکەوت ، بۆیە بە لامانەوە لە ئاوی زەمزەم خۆشترو پیرۆز تر بوو .

برسێتی تینی بۆ هێنابووین، بەڵام لە ئاوەدانیش نزیك بوو بووینەوە ، بۆیە ئەوەی لە بنی کۆڵە پشتەکانمان مابوو دەرمان هێنا کە هەمووی چەند قوتووە ماسییەك‌و کەمێك چنکە نان بوو ، ژەمێکی پێشمەرگانەی ترمان خواردو کۆتاییمان بە قۆڕە قۆڕی زگمان هێنا .

( ئەمڕۆش لەو ناو شاخ‌و جەنگەڵەدا بەرامبەر بە دیمەنە دڵڕفێنەکانی شەقڵاوەو دەشتی هەریرو چیای سەرکەشی سەفین بەسەر دەبەین‌و شەویش لە دەشتی هەریر دەبین بە دوو دەستەو لە یەکتری جیا دەبینەوە...)

* * * * *

بە ناو گوندە ویرانکراوەکانی گەرەوانی سەرێ ، گەرەوانی خوارێ ، بەرەکە ، مامەجەلکەدا ڕەتبووین‌و گەیشتینە جادەی هاملتۆن . ئەو گەشتە پێویستی بە پشووی درێژو وریایی هەبوو ، بۆ ئەوەی بەرگەی مەشەقەتی ئەو ڕێگا سەخت‌و پڕ لە مەترسییە بگرین‌و ماندوێتی ، برسێتی ، تینوێتی ، نەشارەزایی یەکمان نەخەن دەبوو حەوسەڵەمان درێژ بێ‌و سەبری ئەیوبمان هەبێ ، تاکو نەکەوینە ناو داوو کەمینەکانی دوژمنیش دەبوو زۆر وریابین‌و هەموو هەستەکانمان تا ئەوپەڕی برکردن بەکاربێنین . تائێرەش زۆر باشمان هێنابوو هاتبووین؟

لە دەوروبەری جادەکە گەیشتینە ناو بێستانێکی گندۆران . سەرەتا هەرچی کاڵکە گندۆرەیەکی بەردەستمان کەوت لێمانکردنەوەو خواردمان ، چونکە هێشتا نەمانزانی بوو گندۆرە پێ ڕاگەیشتوون‌و گەیون ، بەڵام دواتر هی گەیوشمان دۆزینەوەو لەبەر ئەوەیش هەم برسی بووین‌و هەم گیانمان زۆر پێویستی بە ئاو هەبوو تا توانیمان درێغیمان لە خواردنیان نەکرد، ئینجا کوڵەپشتەکانیشمان پڕ کردن . لە نزیکی ویرانە گوندی میر ڕۆستەمە لە گەڵ ئەو هەڤاڵانەی لە یەکتری جیا دەبووینەوە یەکتریمان ماچ کردو نهێنیەکمان داناو بووین بە دوو بەش : (محەمەدی عەلیی ئۆمەری ، جەلال مستۆك ، مام هادی، حسێن ، شەریف ،کاوێس) بە لایەکداو ئێمەش سێ کەس بە لایەکی دیکەدا ڕۆیشتین .

* * * * *

فەرهاد مەنتك‌و موحسین بانی مارانی‌و من بەو خڕەی خوار ویرانەی میرڕۆستەمەدا بەرەو قووڵایی دەشتی هەریر

چووین‌و لە هیکرا بەسەر ساباتێکی ئاوەداندا هەڵبووین. چووینە ژێر ساباتەکە کەسی لێ نەبوو ، بەڵام دیاربوو سەرەوەی خەڵکی لێ نوستبوو . لە کوپە ئاوە پڕ لە بەفراوەکەی ژێری تێر تێر ئاوی ساردمان خواردەوەو کووزە شووتی‌یەکیشمان لەو نیوە شووتی‌یە کردەوە کە لەسەر کوپەکە دانرابوو ، خواردمان ، ئینجا بە قادرمە تەختەدارەکەدا سەرکەوتین‌و خاوەن ماڵەکەمان هوشیارکردنەوەو دیتمان پیرەمێردێك‌و پیرەژنێکن‌و بە تەنیا لەو نزیك جادەیە دەژیان‌وشیناییان کردبووو هەر بەو بیانووەش گەڕابوونەوە زێدی خۆیان . دوای چاك‌و چۆنی ، هەندێك نانمان لێ وەرگرتن‌و تا ئاقاری گوندی قاسیانە چووین .

بەرە بەیان بوو ، دەبوو تا زووە جێگایەك بۆ مانەوەی ئەو ڕۆژەمان پەیدا بکەین . هەرچەندە شوێنەکە هەمووی دەشت بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی باش شارەزا بووین ،بۆ دۆزینەوەی جێگایەکی گونجاو دانەدەماین‌و پەکمان نەدەکەوت. کانی‌یەکمان پێ دەزانی کە تۆزێك لە وێرانە گوندی خەتیبیان دوورتر بوو ، چووینە سەری ، بەڵام کە چووین دیتمان پیازی لەبەر کرابوو ، ئەوەش نیشانەی ئەوە بوو لانی کەم کەسێك هەیە هاتوچۆی سەر کانی‌یەکە بکات . هەر چۆنێ بێ تا خۆرهەڵات لەسەر کانی‌یەکە بووین ، ئینجا دواتریش لە ناو زەمەندو تەڕاشە چڕەکان پەنایەکمان خۆش کرد . ئیدی تا ئێوارە لەوێ هەر نان‌و کاڵەکمان خواردو خواش کردی ئەو ڕۆژە کەس پەیدا نەبووو نە دیتراین .
فەرهاد دڵی زۆر خۆش بوو، چونکە ئەوێ دوا قۆناغی گەیشتنە ماڵی مام ڕەمەزانی برادەری بوو دەیگوت : ئەمشەو دەگەینە لای‌و دەسێینەوە .

* * * * *

شەوێکی تریش هاتو هەر زوو بەرەو مەرزانی گوندی مام ڕەمەزانی برادەری هەڤاڵ فەرهاد بەڕێ کەوتینەوە . فەرهاد لە پێشەوە دەڕۆیشت ، بەلاّم سەیرمانکرد هەر چەندە تولە ڕێیەکی بێ درکو داڵ هەیە ، کەچی ئەو ڕاستەو ڕاست بە ناو تەڕاش‌و درکو دالاّندا دەڕوات ! چەند جارێك پێمانگوت : با بچینەوە سەر ڕێگاکە ، کەلکی نەبوو . فەرهاد دەیگوت : مەرجی ڕۆیشتنی پارتیزانان ئەوەیە بە لا ڕێیاندا بڕۆن‌و شوێن پێیان لە دوادا بەجێ نەمێنێ !

-هەڤاڵ فەرهاد ئەوە ڕاستە ، بەلاّم خۆ دوژمن هەستی بە ئێمە نەکردووەو لەو چۆلەوانیەش کێ دێ تاقیبی شوێن پێ بکات؟ خۆ هەر ئەمشەویش شوێن پێیێ یەکانمان کوێر دەبنەوە .

-نەخێر دوور بڕۆ و سەلامەت وەرەوە باشترە !

کە زانیمان فەرهاد بە قسەمان ناکات ئێمەش هەردووکمان چووینەوە سەر ڕێگاکەو ئیدی فەرهاد ما تووڕە بێ و بپنگێ . دیار بوو هەر بۆڵە بۆڵی دەکرد، بەلاّم ئێمە گوێمان پێنەداو ئەو لە دەرەوەو ئێمەش لەسەر ڕێگاکە بە تەنیشت یەکتریەوە دەڕۆیشتین ! کە موحسین زانی فەرهاد تووڕە بووەو داویەتیە کەللە ڕەقیش بۆ زیاتر تووڕە کردنی بە هەرچی هێزی خۆی هەبوو شەپ شەپ پێیەکانی لە عەردەکە دەدان‌و تۆزی ژێر پێ پانەکانی مەترێك بەرز دەبووەوە . هەندێ جار موحسین قاچەکانی بە ئاراستەیەکی دیدا دەهاویشتن‌و هەر بۆ خۆشیی خۆمان‌و وەڕس کردنی فەرهادیش دەیگوت : ئەوەش بۆ ئەوەی سەر لە دوژمن بشێوێ‌و نەزانی ئێمە بە چ لایەکدا ڕۆیشتووین!..

تا دەهات فەرهاد تووڕەتر دەبوو ، بەڵام لە ئەنجامدا ملیداو هاتەوە سەر ڕێگاکەو گوتی : من لەبەر خاتری ئێوەمە ، ئێوە لەبەر کێتانە ؟ .. قابیلە من بترسێم !.

بەڕاستیش چ فەرهادو چ موحسینیش هێندە ئازا بوون ئەوەی بیریان لێ نەدەکردەوە ترس بوو .

دەشتی هەریر زۆر گەرمو ئێمەش زۆر هیلاك بووین ؛ بۆیە لە سەرەخۆ دەڕۆیشتینو من پێم باش بوو یەکسەر بڕۆین ؛ بەڵام هەڤاڵ فەرهاد پێی لەسەر ئەوە داگرت کە هەر بچینە گوندی مەرزانوماڵی مام ڕەمەزانی برادەری . شایانی باسە مەرزان هەر ئاوەدان بوو ؛ چونکە زۆربەی گوندەکانی هۆزی خەیلانیو هەموو گوندەکانی هۆزی سورچیش لە دەشتی هەریر تێکنەدرا بوون و خەڵکەکەیان لە شوێنی خۆیانیان بوون، بەڵام هەموو گوندەکانی تری هۆزی هەرووتی و هۆزی خۆشناو ڕاگوازرابوون ، بێگومان ئەو جیاوازیکردنەش بێ هۆ نەبوو .

* * * * *

لە سەر قسەی هەڤاڵ فەرهاد چووینە گوندی مەرزان

– مام ڕەمەزان خۆت بگرە ، هاتین!

ماڵی مام ڕەمەزان لە لا چەپێکی گوندەکە بوو ، گردۆلکەیەك لە بەرامبەر ماڵیان بوو ، ئێمە لەسەر ئەو گردۆلکەیە لە چاوەڕوانیدا ماینەوەو هەڤاڵ فەرهادیش بەرەو ماڵی مام ڕەمەزان چوو . جارێ هەر لە دوورەوە سەگەکانیان پەلاماری فەرهادیانداو کوڕێکی مام ڕەمەزان هاتە دەرەوەو لە یەخەی کردنەوە . فەرهاد بە تامەزرۆیی دیدارو پێویستی لە ڕادەبەدەری برادەرایەتیو ناسیاوی گەرمو گوڕ لەسەر هەمان ئاوازی سەردەمی پێش ئەنفال لە مام ڕەمەزانو کوڕەکانی چووە پێش، بەڵام وەڵامی پێویستی

وەرنەگرتەوە . سەرەتا فەرهاد وایزانی نەیان ناسیوەتەوە وەکو خۆی دەیگوت ، بۆیە هەر زوو گوتبووی : من فەرهاد مەنتکم ! کەچی ئەوان خۆیان لە گورە نەبردوو هەر بە ساردیو بێ بایەخ وەلامیان دایەوە !.. ئەو دلسۆزیو گەرمیەی فەرهاد لە کوێو ئەو ساردو سڕیەی ئەوان لە کوێ !

( ئەی خودایە ئەوە ئێمە گۆڕاوین یان ، خەلکەکە) فەرهاد دەیگوت : بە سەر سوڕماوی ئەو پرسیارەم لە خۆم دەکردو دووبارەم دەکردەوە .

بە هەر حال فەرهاد پێی گوتن :

- ئێمە مەفرەزەیەکی پێشمەرگەینو بۆ لای ئێوە هاتووین .
- بۆچی هاتوون ؟
- بۆ ئەوەی پشوویەك بدەین، نانێك بخۆینو بڕۆین ، مام ڕەمەزان خۆ ئێستا دەمناسیتەوە ؟

- بەلێ دەتناسمەوە، بەلام ئێرە جێگای پشوودانو نانخواردن نیە !

- مام ڕەمەزان ئێمە ڕوومان لە مالی ئێوە کردووەو قەتیش کورد میوانی خۆی ئەوها بەڕێ نەکردووە !

- من ناتوانم لە پێناوی نانداني ئێوەدا سەری خۆمو مالو منالی خۆم بفەوتێنم !.

- مام ڕەمەزان دلنیابە کەس نافەوتێو ئێمەش هەرگیز ئەو نهێنیيە نادرکێنین !

-زۆری وەك تۆ ئەو قسەیان کردو پاشان وا دەرنەچوون .

- باشە دەڕۆین ،بەلام هەندێك نانو پێخۆرمان بدەنێ .

- ناتوانین !

- ئەدی چی بکەین ؟ خۆ ئێمە ناتوانین بچینە هیچ ماڵێکی تر .
– وا باشە نەچن دەنا هەر سەریشتان تێدەچێ !
– باشە تەنیا تۆ نانمان بدەنێ واتا سەرو نانێك ( بۆ ئەوەی نەزانن ئێمە چەند کەسین ) .
– باشـە، بەڵام بەو مەرجەی بانگی موختارو هەموو ریش سپیانی گوندەکە دەکەم ، ئەوجا ئەگەر ئەوان قایل بوون بەسەر چاو !
- جا ئەوە چۆن دەبێ؟
– نابێ خوا حافیزت بێ !
- ئەی هاوار مام رەمەزان ،بۆ وای لێهات ؟
– بەڵێ ئەم رۆژگارە هی ئەوە نیە تۆ ئەو داوا قورسە لە ئێمە بکەیت .
- باشە لە برسان بمرین ؟
– کەیفی خۆتانە .
– قەیدی نیە تەنیا سێ نانم بدەنێو دەڕۆین .
– بێ ئەوەی موختارو ریش سپیەکانی گوند ئاگادار بێ نیو نانیشتان نادەینێ !
– کەواتە خوا حافیز ،ئەوەش بزانە هەرشتێك روویدات ئەنگۆ بەرپرسیارن ، رۆژگاریش هەر ئەم رۆژگارە نابێ ، مام رەمەزان!
– خوا حافیز .
وتـووێژی نێوان هەڤاڵ فەرهادو ئەو برادەرەی کە ئومێدێکی زۆری لەسـەر هەڵچنی بوو بەم شێوەیە بوو.ئێمەش هەر لە چاوەڕوانیدا بووینو لە پڕ فەرهاد بە هەڵەداوان گەڕایەوەو گوتی : با بڕۆین !

- بۆ کوێ ؟
– وەرنە دوامو قسە مەکەن .
فەرهاد هانکە هانکی دەهاتو ئێمە وامانزانی نانو خواردنی هێناوەو دەیەوێ زوو لە گوندەکە دوور بکەوینەوە . چەند جارێك پرسیارمان کرد هەڤاڵ فەرهاد ئەوە چی بووە و بۆ وا مشەوەش بوویت ؟ ئەو هەر وەڵامی نەدایەوە بەڵام کە لە گوندەکە دوور کەوتینەوە گوتی :
– ڕەنگە خەبەرمان لێ بدرێ، چونکە ئەو بێ شەرەفانە گۆڕاون .
- ئەدی خواردن ؟
– خواردنی چی !
فەرهاد زۆر زۆر نیگەران بوو ، بۆیە دەیگوت : تو خوا دەوەرە بۆ ئەو خەڵکە خۆت بە کوشت بدە .
هەڤاڵ موحسینیش بە توڕەیی‌و نیگەرانیەوە دەیگوت : ئەو خەڵکە هەموویان زۆر باشن تەنیا برادەرەکانی تۆ خوێڕین . ئەوە چەند ڕۆژە مام ڕەمەزان مام ڕەمەزانتەو ئەوەش مام پیاوەکەت !
– کاکە ئەمن کو بزانم ئەو خەڵکە ئەوها گۆڕاینە !
فەرهاد بە دەم ڕۆیشتنەوە هەموو ئەو قسانەی بە کەسەرو نیگەرانیەکی قووڵەوە گێڕانەوە کە لە پێشەوە باسمان کردن .
ئەو هەڵوێستە ناجوامێرانەی مام ڕەمەزان ناخی داخ کردین‌و لە برسان‌و لە میلاکیانیشدا لە جێگایەك هەر لە ناو پووش‌و پەڵاش‌و لە ژێر ڕەحمەتی ویزە ویزی پێشکە ژەهراویەکانی دەشتی هەریر ڕونیشتین . هەرچەندە موحسین پیاوێکی کەڵەگەت‌و هەمیشە ورە بەرز و بە توانا بوو، بەڵام وا پالکەوتبوو هەر هەڵنەدەستایەوەو هەرچەندە دەمانکردو دەکۆشاین بێ سوود بووو دەیگوت :
- لێ گەڕێن با مام ڕەمەزانی هەڤاڵ فەرهاد بێ بمانکوژێ .

ناوە ناوەش دەیگوت :

- وەڵڵا بووینە ڕێوی !

فەرهاد تا ئەو کات بە ناوهێنانی ڕێوی مەلەکان تورە دەبوو ،بەلام لێرە هەڵوێستی برادەرەکەی لەسەری دەسەپاند کە بێ دەنگو بەو سوعبەتانە قایل بێ کە زووتر پێیان تورە دەبوو !.

بە برسێتیو هیلاکیەکی زۆرەوە بەرەو دواوە گەڕاینەوە ، خۆمان گەیاندە بێستانە گندۆرەکانی نزیکی ئۆردوگای باسرمەو جارێکی تر کۆڵەپشتەکانمان پڕ گندۆرە کردنەوەو بەرەو بێشەڵانەکەی سەرەوە هەڵکشاین، بەرە بەیان لە ناو بێشێکی نەدیتە جێگای خۆمان خۆشکردو ئەو ڕۆژەشمان تا ئێوارە بە تەشقەڵە فرۆشتن بە هەڤاڵ فەرهاد بەسەر برد .

* * * * *

گندۆرە بە تەنیا نەیدەژیاندینو پێویستی زۆریشمان بە خواردنێکی چەورو چایەکی گەرم هەبوو، بەلام ئەمانە لە کوێ دەست دەکەوتن ؟ بە دووربین سەیرمان کرد ڕەشماڵێك لە نێوان وێرانە گوندی خەتیبیانو باسرمە دیارە . باش باش چاودێری ناوچەکەمان کردو ڕۆژئاواش خۆمان گەیاندە ئەو ڕەشماڵە . لەبەر ئەوەی لە پێش ئەنفالەکاندا فەرهاد ماوەیەکی زۆر بوو لەو ناوچەیە بوو ، زۆربەی خەڵکەکەی دەناسیو منیش لەوێ هەر ناسراو بووم ، بەلام بۆ ئەوەی نەناسرێینەوە بە جەمەدانیەکانمان دەمامکماندا‌و بڕیارماندا هێشتا خۆمان ئاشکرا نەکەین، چونکە وەك دەڵێن هێشتا نەکەوتبووینە سەر قاچی خۆمان . کە چووین ماڵەکە زۆر بە گەرمی بەخێر هاتنیان کردینو خواردنێکی باشیان بۆ هێنایین . دوای نان خواردن لە پڕ فەرهاد جەمەدانیەکەی لە سەر دەمو چاوی لابردو گوتی:

- من فەرهاد مەتتکم !..

هەروەها پرسەی مردنی براکەیان ( غازی) پێ ڕاگەیاندنو داخی خۆی بۆ هەڵڕشت ! ئێمەش بەو خۆ ئاشکراکردنەی فەرهاد تووڕە بووین ، بەلام ئەو دەیگوت :

- دیار بوو ئەوان هەروەکو خۆیان ماونو دڵسۆزن بۆیە خۆم ئاشکرا کرد !.

- باشە تۆ چۆنت زانی ئەوانیش نەگۆڕاونو خەبەرمان لێ نادەن؟

-لە لوتفو میوانداریانرا دیاربوو !

سەرەڕای ئەوەی دوای ئەو هەموو شەوو ڕۆژ ڕۆیشتنە بۆ یەکەم جار خواردنێکی چەورو گەرممان لەو ماڵە خواردو زانیاری زۆریشمان لە بارەی ناوچەکە لێ وەرگرتنو شەکرو چاو نانێکی باشیان بۆ دانابن . ڕۆیشتینو ئیدی تا گەلی ئازەرانی خەیلانەتی ڕانەوەستاین .

* * * * *

گەلی ئازەران گەلییەکی گچکەی تەنگو درێژکۆڵەیە لە ناو قەدی زورگی سەری سەرکەندی دەست پێ دەکاتو تا دەشتەکە درێژ دەبێتەوەو لە هەمان جێگاشدا کانییەکی ڕوونو زوڵاڵ لە نێوان تاتە بەردەکاندا هەڵدەقوڵێ. ئەوەندەی خاکو خۆڵ بەشی کردبێ قامیشو پونگو داری بیو هەناری لێ ڕواون وپێی گەیاندوون . بۆیە ئەو دۆڵە تەنگە پڕ لە سەوزاییە جوانیەکی سەیری بەو ناوە داوە ، هەر لە سەرچاوەی ئاوەکەوە تاکو خوارەوە چەندین سەرچاوەی بچووکتری ئاو هەڵدەقوڵێنو یەکتری دەگرنەوەو دەبنە جۆگەیەکی جوانی پڕ لە ژیانو بەرەو گوندی کەلەکین دەڕوا . هەر لە سەرەوەڕا تاکو نزیك کەلەکین تادێ دۆڵەکە هەم بەرینترو هەم قووڵتر دەبێتەوەو لە پێدەشتەکەشیدا

دەیان دار چناری تەمەن سەدان ساڵە دیمەنەکەیان ڕازاوەتر و جوانتر کردووە . شوێنەکە هەم سێبەرو هەم ئاوی هەیەو هەمیش لەچاو دەڤەرەکە تا بڵێی بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن گونجاوە .دەوروبەرەکەی ڕووتەنەو بەرامبەریشی هەر لە هەریرەوە تاکو سپیلکو سەر زێی بادینانیش بە درێژیو بە پانی باش دیارەو هەموو جۆرە جووڵەیەکی تا ئاسایی لێ دەبیندرێ ، بۆیە لە پێش ئەنفالەکانیش ئەوێ هەمیشە جێگای خۆ شاردنەوەو پشوودانمان بوو .

دوای تێکشکانی هێزی پێشمەرگەو بەئاکام گەیشتنی پرۆسە جینۆسایدییەکەی دوژمن جێگایەك نەمابوو لێ ی بحەوێینەوە ، بۆیە ئێمەش بڕیارماندا بەرەو ناوچە سنوورییەکانی ئێران هەڵکشێین ، لەو پێناوەشدا بەدوای دایکمدا نارد تابێتە لام بۆ ئەوەی ماڵئاوایی لێبکەم ، لەگەڵیی ئازەران هاتەلامو لەوێ ئەو پێی گوتم کەتۆ لە تورکیا گیراویتو لەزیندانی دیاربەکری ! ئەوکات سەرم سوڕماو گوتم ئەو لەکوێو زیندانی دیار بەکر لەکوێ ؟! کەچی ئەوەخۆشم هاتە هەمان زیندانو لای تۆ بەبێ ئەوەی سەریشم لەوگێرانەی خۆم بسوڕمێ ! ساڵێك زووتر ئاسۆ حاجی خزمو برادەرم لە زیندانی دیاربەکر ئەو قسانەی بۆ کردم ، کەچی ئێستا خۆم لەهەمان شوێنمو ئاسۆش لەسەر چیای قەندیل بارە قاچاغەکان گومرگ دەکات !

ئەوە مێژووە ئێمە لەناو بازنەی خۆیدا دەخولێنێتەوە یان ، نیشتیمانە هەمیشە بەرەو ئامێزی سۆزی خۆیمان ڕادەکێشێتەوە ؟

* * * * *

ئەو جارەش بە یادی جاران چووینەوە ئەوێو لە ژێر سێبەری دار هەنارێکی ناو قامیشەڵانێکی چڕدا بارگەمان دانایەوە . خۆر لە ئاسمان هەڵکشاو لە پڕ مێگەلە مەڕێك بەو ناوە وەر بوو

. لەبەر ئەوەی نەمان دەویست تا دەگەینە شوێنی مەبەست کەس بمانبینێو ئاشکرا ببین خۆمان لە ژێر دار هەنارو ناو قامیشەلانەکە گرمۆلە کرد . چەند بزنێك ئاوقـای دار هەنارەکەی سەر سەرمان بوون‌و گەلایان دەخـواردو مێگەلەکەش دوور کەوتەوە . شوانەکە لە دوورەوە را چەند خـرکە بەردێکـی لـە بزنەکان گرتن‌و خـوای نەکرد بە بەر بکەوین ، دەنـا هەمـووی لـە دەوروبەرمان دەدان‌و جوێنیشی بە خاوەنی بزنەکان دەدان ، بـەلام نـەمان دەزانی لە خۆی وەرسەو جوێنەکان بە خۆی دەدا یاخود، شوانی کەسێکی ترە ؟

ئێمەش لە ژێرەوە هەم لە ئاشکرا بوون‌و هەم لە گاشە بەردەکانی شـوانەکە دەترسـاین‌و دلمان بە خێراییەکی نا ئاسایی لێی دەدا ، کەچی لـە هەمان ساتدا منداڵێك کە لەگەڵ شوانەکە بوو بەراکردن بەرەو لای ئێمە هات ! شوانەکە تێی راخوڕی‌و گوتی : وەرە برۆ سەری مێگەلەکە بگێرەوە .

– نا ، ئەچم هەناران لێ ئەکەمەوە ئەوجا مێگەلەکە ئەگێرمەوە.

– کورم ، هێشتا هەنار پێ نەگەیشتوون‌و درەنگە با مێگەلەکە بڕ نەبێ .

– باشە لێیان ئەکەمەوە ئینجا حەیوانەکان ئەگێرمەوە .

– هـەی سـەگی خوێـڕی وەرە بگەڕێـوە بـا گاشـە بـەردێکت نەخێوێنمە گازەرای پشتێ .

ئێمە بە ترس‌و لەرزەوە گوێمان لەو بەزمەی شوانەکەو کوڕەکەی گرتبوو ، هەرکە دلنیا بووینەوە شوانەکە رێگەی کوڕەکەی نادات ئەوکارە نابەجێیە بکات ! لە جێگەی خۆمان خەنی بووین .

– ئۆخەی خۆ رۆیشت .. ئەی لەو منداڵە چەقە بازو خوێڕییە !

پێدەچوو یەکەم جار بێ شوانەکە مێگەلەکەی بگەیەنێتە ئەوێ، بۆیە هەم بزنەکان هەڵپەیان لە خواردنی گەڵا هەنارەکە دەکردو هەم کوڕەکەش دەیویست کوتکە هەنارەکان لێ بکاتەوە .
لەو کەین و بەینەدا موحسین گوتی : ئاشکرا بووین!
چۆن ؟
– چۆن ! ئێمەیان دی .
– نا وانیە .
– بە خودای بینراین ، بەڵام مەترسن زمانمان لێ نادەن .
ئەگەر بینراوین چۆن دەزانی زمانمان لێ نادرێ ؟
– ئاخر ئەوانەی ئێمەیان دی زمانیان نیە !
کێ ؟
– بزنەکان ئێمەیان دی و ئەوانیش بەستەزمانن !
خواگیر لێرەش واز لە قسە قۆڕەکانی خۆت هەر ناهێنی ؟
نیوەڕۆ بوو ئاگرێکی بێ دوکەڵمان کردەوە ( ئاگری بێ دوکەڵیش وەستایی دەوێ و بە هەموو کەس ناکرێتەوە)و لە بنە مەتارەکانمان چایەکی سەیلانمان لێ ناو بەدەم یادکردنەوەی ڕۆژانی پێش ئەنفالەکان نان و چایەکمان خواردو موحسین، دیسان گوتی :
–یاخوا لەسەرو ماڵت بە زیاد بێ مام ڕەمەزان !
فەرهاد بە غەمگینییەوە سەیرێکی کردین و گوتی : کاکە لە ناو ئەو هەموو ترس و لەرزە خەڵکە ناحەقیان نیە کە گۆڕاون!
–باشە بۆچی ماڵی غازی ڕەحمەتی و فەیسەڵە قەمبوور نەگۆڕابوون ،خۆ چ برادەریشمان نەبوون ؟
–کوڕە چوزانم ، مام ڕەمەزان سەگبابەو پۆتی منیشی شکاند...

ئازاری قاچم بە تەواوی هیلاکی کردبووم و ئەوێش جێگایەکی لەبار بوو بۆ ئەوەی بیکەمەوەو هەندێك بە ئاوی گەرم بیشێلم. هەرکە گۆرەویەکەم داکەندو پەڕۆکانم لێ کردنەوە ،موحسین گوتی :

– ئەوە هی تۆ دیارە ،بەڵام ئەدی فەرهاد چی لێ هاتووە ؟

هەر ئەوەندە فەرهاد تەقیەوەو گوتی : بەڕاستی ئێوە شایانی ئەوە نین هاوڕێتیتان بکرێ ، دەبەسەو بڕایەوە .

ئەودیسان لەبەر مەسەلەی ڕێوییەکە تووڕە بووەوە .

قاچەکانم سەرەڕای ئاوسان دەیان دڕكو چقڵی سەر ڕێگا بە تایبەت دڕکە گوێنیەکانی گورتێنسو لە پێستو گۆشتیاندا چەقیبوون‌و ئەوەندەی توانیم دەرم هێنان‌و قاچەکانم پاك کردنەوە .

هەوارەکەمان بەرز و، پڕ لە ئاوی سازگارو ، کەسکایی‌و تیشکی خۆرونسێ بوو ، بەڵام ڕوتەنی تەلانەکانی هەردوو لای ڕاستو چەپمان دەرفەتی گەڕان‌و سوڕانیان نەدەداین ، بۆیە تا ئێوارە درەنگ هەر لەو بن پەرچانە خۆمان مات کردو نەهاتینە دەرەوە .

ئێوارەش ، بەرە بەری خۆر ئاوابوون ، تا کاتی جووڵان مات بە خشکەیی‌و ئەم پەناو ئەو پەنا هەموو ئەو سەکۆو ناو ڕازو نوا شاخاویانەمان بەسەر کردنەوە کە دەیان جاری تر بۆ خۆ لە دوژمن تەقەت کردن‌و پشوودان لێیان مابووینەوەو، بە یادی جاران داخمان دەخوارد ، کە ئەم جارە بە هۆی ئەنفال‌و دوورکەوتنەوەی ئەو ماوە دوورو درێژە نەماندەتوانی ڕاستەوخۆ داکشێینەوە ناو گوندی کەڵەکێن و،دیسان ببینەوە میوانی فەرحان ئاغاو باس‌و سەرگوزشتەکانی پێ بگێڕینەوە . لێرە دوای چەندین گۆڕانی گرینگی گشتی‌و تایبەتی‌و دوای تراژیدیاکانی

کیمیابارانکردن و ئەنفال .. ئێمەش گەڕاوینەتەوە نیشتمانی خاڵی ... لێرە لە گەلییە تەنگەکەی ئازەران لەسەر ئەو قۆریە فافۆنە دەگرین یان ، پێدەکەنین کە سەردەمانێك چایمان تێدا لێدەناو دواتریش بۆ جاری داهاتوو لە کونە شاخێکمان دەشاردەوە، ها.. ئەمجارەش بۆ وروژاندنی یادەوەریەکانی سەردەمێکی جیاواز دەری دێنین‌و رابردووی پێ وە بیر خۆمان دێنینەوە !. لێرە ، هەڤاڵ موحسین لێم دەپرسێ:

– پەشیمان نیت لەوەی لە تورکیا را گەڕایتەوەو نەچوویتە ئەورووپا !

– ئەگەر پەشیمان بام نەدەگەڕامەوە ....نیشتمان خۆشەویستەو، دووریش هێندەی تر بەم خاکەیەوە بەستمەوە ،بڕوابکە هەرچەند کات تێدەپەڕی‌و هەرچەند دوور دەکەوتمەوە هەمیشە لە ناخەوە لە نیشتمان نزیکتر دەبوومەوە . هێزی راکێشانی نیشتمان‌و سۆزی دووری‌و غوربەت سنووری کات‌و شوێنیان بەزاندو ناچاریان کردم بگەڕێمەوەو لە وڵاتی خاپووری خۆم لە بنەمەتارەیەکدا لەسەر ئاگرێکی بێ دووکەڵ لەگەڵ ئێوەدا چای لێ بنێمەوە ..ئێوە سەیرکەن نیشتمان خەمەکانیشی چەند کاریگەرن‌و چۆن هەستی مرۆڤانەمان دەجوڵێنن‌و خۆشییان لێوەردەگرین‌و هەر ئەوەشە وا دەکات ئێمە سێ کەس بەتەنیا بە رواڵەت لە چۆڵەوانیدا یاغییانە ، بەلاّم لە ناخ‌و راستیدا لەگەڵ تەواوی کوردو لە پانایی کوردستاندا بژین .. سەرەڕای ئەوانەش هیچ نەبێ ئازادین‌و بە ئازادی خۆمان‌و لە پێناوی ئازادی گەلەکەمان ئەم ڕێگایەمان هەڵبژاردووە . ڕاستە ئەرکمان گران‌و ژیانمان دژوارە ، بەلاّم سەربەرزو ئازادین ؟ ئەی ئازادیی ! خۆ ئەگەر زەوتیش کرای خەبات لە پێناوتا هەر ئازاد بوونە ....

هەمووی چەند شاقاوێك لە كەڵەكینەوە دوورین ، بەڵام ناتوانین بچینە ناوی ! كەچی یادەوەرییەكانی ئەو گوندە هەنگینیو ئێستاشی لەگەڵدا بێ لە هزردا سەرەتاتكێیان دەكردو دەكەنو لە ژێر فشاری ئەو یادەوەریانەدا ناچارم ئەو شەوەی زستانی هەشتاوحەوت وە بیر خۆم بخەمەوە كە فەرحان ئاغا بۆی گێرامەوەو گوتی :

–دوێنێ شەوێ سێ پێشمەرگە ! ( ، ، ، )1 كە دوو مەنسولو پێشمەرگەك بوون ، هاتن نانیان خواردو كەوتنە ناو قسان . ئەوان زۆر جاری تریش هاتبوونە لامان، بەڵام قەت وەك ئەم جارە ناماقوڵ نەبوون !

–بۆچی مام فەرحان ئاغا چییان دەگوت ؟

–چییان دەگوت ! وەڵڵا ببێم ع !.. ئێ ئەوان گوتی ئێ گێرانەوێش نیە !

–ئەوان عەفویان فەرمووە،مام فەرحان ئاغا ئەتو مەسەلەكە بە تەواوی بۆ ئێمە بگێرەوە با بزانین چیان كردیە ؟

دوای پرسیارو بە دوادا چوون دەركەوت لە ئەنجامی گفتوگۆدا یەكێك لەو سێ هاورێ تێكۆشەرو دڵسۆز ومارکسیستە–لینینیستە عەیار بیستو چوارانە بە فەرحان ئاغای سەرۆكی هۆزی خەیلانی دەڵێ : ئەگەر ئێمە دەسەڵات بگرینە دەست ئەوا هەموو دەوڵەمەندو جاشو ئاغاكانی وەك ئێوەش جڵەو دەكەینو..... !

فەرحان ئاغاش كە هەم سەرۆكی هۆزو هەم نیشتمانپەروەریش بوو، تورە دەبێو هاواری كورە گەورەكەی دەكات :

– جوان .. هۆ جوان !

–ها بابۆ فەرموو چتەوێ ؟

---

1 بۆ ئەوەی مەلا ئاوات تورە نەبێ ناوەكانم نەنووسین !

– کورِم برۆ ئەو قەراستەیە لەو ئێسترە شەلەی ئەم برادەرانە بکەرەو بۆم بێنە !
بابۆ لۆ چتە ؟
– تا ئەو میوانانەم پەتك بکەم !
لۆ چییان کردیە بابۆ ؟!
– وەڵڵا دەمەویٚ تا ئەوان دەسەڵاتیان نیەیە ، من دەست پێشخەری بکەم .
فەرحان ئاغا زۆر بە نیگەرانی ئەو قسانەی بۆ دەگێرامەوەو هەروەها دەیگوت :
– تۆ سەیرکە ، سەیرکە .. ئەوانە دەیانەویٚ بە سیٚ کەس و ئێسترێکی شەلەی قۆڕ سەدامی بڕوخێننو حوکمیش بگرنە دەستو خەڵکیش جڵەو بکەن !
– ئیٚ دواتر ئەوان چییان کرد ؟
–تورە بوونو ڕۆیشتن .. تخوا باشم نەکرد ئیوەهەم لێکردن ؟
–نا ئەوان مەبەستیان هێندە خراپ نەبووە کە تۆ بەم شێوە لێیان تێگەیشتووی مام فەرحان !
هەر لەو گوندەدا ڕۆژێکی تریان لەگەڵ شاخەوانی هاوڕێم لە ماڵێك میوان بووین پێنج– شەش ژنی لیٚ بوون . دیار بوو هەم ئێمەو هەم ئەوانیش تامەزرۆی قسان بووین . ئەو کاتیش قسەی بنی زمانو سەری زمانی ئێمە هەر شۆڕشو شۆڕشگێڕیتی بوو ، بە هەموو بوارەکانیەوە . قسەمان هێنایە سەر مەسەلەی ژنانو ڕۆڵیان و چۆنێتی بەشداری کردنیان لە شۆڕش ، بەڵام سەرەتا جگە لە کچێك ئەوانەی تر هەموویان دژی ئەو مەسەلەیە بوون . ئێمەش کارمان چیەیە ئەگەر تێیان نەگەیەنینو هەوڵی هوشیارکردنەوەیان نەدەین ؟ دیارە ئەو کارەمان هەر بە ئەرکێکی پیرۆزو بەردەوامی سەر شانی خۆمان دەزانی، بۆیە بۆی هەبوو تا

قەناعەتـیان پــێ بێـنین بــە دیاریانــەوە دابنیشــین ! ئــەو دانیشتنەشمان بە هەل زانیو سەرەتا بە نموونەی سادە دەستمان پێ کرد و پێمان گوتن:
تەنانەت ئامادەکردنی خواردنیش بۆ پێشمەرگە بەشداریکردنو خزمەتێکی گەورەی شۆڕشە . بەلام ، هەر زوو ژنێك هەڵیدایێو گوتــی : ئــەی ڕۆ ئــەوجا ئــەوە چ منەتێکــی تــێدایەو مــیوان خۆشەویستی خوانو هەر دەبێ نانیان پێ بدرێ و خزمەت بکرێن !.
ئێمە وردە وردە لەگەڵیان دەچووینە ناو باسەکەو تا دەشهات گەرمتر دەبووینو زیاتر پەلەمان لە تێگەیاندنو پێگەیاندنیان دەکردەوە !.. نازانم چۆن بوو،چووینە سەر باسی شۆڕشی ڤێتنامو بەشداریکردنی ژنان لەو شۆڕشەداو باسی ژنێکمان بۆ کردن کە چێشت لێنەری ئۆردوگایەکی سەربازیی ئەمریکی دەبێو لە دەرفەتێکدا خواردنەکە پڕ لە ژەهر دەکاتو ژمارەیەکی زۆری سەربازە ئەمریکییەکان دەکوژێت . هەر ئەوەندەو ژنێك لەولاوە گوتی :
—هەی قوڕ بەسەری ئەو ژنە !
—بۆچی؟
—ئەدی قیامەت چ دەکات ! ئەو بابان ویرانە هەنگی چ دەکات هەنگی ؟!
یەکێکی تر گوتی : ئەو ژنە کافرە ئەو قەتڵ وعامەی کو کردیە !
زانیمان کە تێکەوتینو ئەوان هەر وا بە ئاسانی هوشیار ناکرێنەوەو ناچار بۆ ئارامکردنەوەیان گوتم :
—پوورینە گوێ بگرن ، یەکەم سەربازە ئەمریکییەکان کافر بوونو ئەوانیش وەك بەعسیەکان گوندیان کاول دەکردنو مزگەوتیان دەسووتاندنو خەڵکیان دەگرتو دەکوشتو .........

لەبەر ئەوە ئەو ژنە موسڵمانەش ئەو کافرانەی کوشتن !.....
لەگەڵ ئەم قسانەدا ژنەکان هێور بوونەوەو ئینجا یەکیان گوتی:
- ئەو ژنە دەستی کەسکن !
-ئەوەی دی گوتی :
-دەك بە قوربانی دەستانی بم ، خۆزگەم بە خۆی !
لە پڕ ژنێکی تر پرسی :
-پاشان چییان بەسەرهات ؟
-عەسکەرە کافرەکان ؟
-نا نا ئەوانەی غەدریان لێدەکرا ؟
-ڕزگاریان بوو .
پیرەژنێکی تر لەولاوە هاتە ناو باسەکەوەو پرسی :
-ئەو ڕزگار چاو شینەی لەگەڵ ئێوە دایە .
-بەڵێ ، بەڵێ پوورێ ئەو ڕزگارەیان بوو !
پاش ئەو گفتوگۆیانە ئێمە بە نیگەرانییەوە هەستاین خوا حافیزیمان کردو ئەوانیشمان بە خۆشحاڵی خۆیان بە جێهێشتن....

* * * * *

لەوێ ، لە گەڵی چۆڵو هۆڵی شازەران هەر خۆمان لە خۆمان دەپرسییەوە :گەلۆ ئاڵای شۆڕش .. کۆمەنیست .. زەحمەتکێشان.. یەکێتی .. پارتی .. سوشیالیست .. کوان ؟ زووتر لێرەو لەوێ بە بیانوو لەسەر واتە واتی ناو کتێبان لە یەکتری هاوێر دەبووین و لەسەر دەسەڵاتێکی وەهمیش یەکتریمان دەکوشتو هەر کەسەو بە پێی دەقە وشکو ڕەقەکانی پەیڕەوو پڕۆگرامەکانمان دەمانویست خۆمان بسەپێنین و.... بەڵێ، لە ناو خۆماندا چەندان بووینو ئێستاش نیشتمانی هەمووان وێرانەو گەلی هەموانیش نزیکە قڕانە ،قڕان ...! لەو هەوارە بەرزە ئەو

پرسیارانە مەودای سۆزیان بە قەد دەریایەك فراوان دەكردو گڕكانی گریانی لە ناودا دەتەقیەوە .. ئای ! ئەگبەتی خودپەرستی‌و چاولێكەری دوگمای وشك‌و واتە واتی بێ هودە چەند دژوار بوون ؟

* * * * *

ئاسۆی ڕوونی دەشتی هەریر ڕەشماڵی تاریكی بەسەردا هەڵكشا ، ئێمەش ڕوومانكردە چیای سپیلك‌و ڕۆیشتین . درەنگی شەو گەیشتینە بناری سپیلك‌و لەوێ لە سێ ڕیانی قەندیل –شەقڵاوە – خەلیفان بە هۆی ڕەبایە زۆرەكانی سەر لێواری جادەكان زۆر بە زەحمەت پەڕینەوە،ئینجا یەكسەر چووینە سەر بانی ڕۆژ ئاوای گوندی ئافریان ، لەوێ بە وردی ناو گوندەكەو دەورو بەریمان پشكنی، كە بارودۆخەكەمان ئاسایی دی من گوتم :
– هەڤاڵان ئێوە لێرە چاوەڕوان بن‌و منیش دەڕۆمە ناو گوندەكەو ئاگاداریی ئەو ماڵە دەكەمەوە كە بۆی دەچین ئەوجا بە دوای ئێوەشدا دەگەڕێمەوە .
– زۆر باشە ، ئێمە لێرە دەبین‌و تۆ فەرموو، بەڵام وەكو فەرهادو ماڵی مام ڕەمەزان نەگەڕێیتەوە ! موحسین ئەمەی گوت‌و منیش ڕۆیشتم .
خەڵكی ئافریانیش وەكو هەموو خەڵكی گوندەكانی تری سورچیایەتی بە بێ خۆشی‌و بێ ناخۆشی خۆیان چەكداری ڕژێم بوون ، بۆیە لەو هەلومەرجەداو چوونە ماڵێكی ئەو گوندە بە بێ ئاشكرا بوون هەندێك سەخت بوو ، بەڵام لەبەر ئەوەی پێش ئەنفالەكانیش من زۆر هاتو چۆم كردبوو وەهەروەها كۆمەڵێك هەڤاڵ و دۆست‌و خزمی زۆر دڵسۆزیشم لەوێ بوون كارەكە ئاسان‌و لە پێش چاوان كردەنی بوو ، هەرچەندە دوو شت هەبوون

ئەگەری ئەوەیان لێ دەکرا لە ڕێگە کێشەم بۆ دروست بکەن :
یەکەم : لەبەر ئەوەی ماڵی هەڤاڵ عومەر لاوە ( کە من بۆ ئەوێ دەچووم) لە لاپەڕێکی گوندەکەدا بوو، دوژمنداریش بوون ... جا بەو شەوە لە لای چۆڵەوانییەوە چەکدارێك بەرەو ماڵیان بچێ کێ دەڵێ بە دوژمنی خۆیانی نازانن ؟ خۆ ئەو کات تەنانەت دەنگدانیش کێشەیەکە نەخوازەڵا تەقە لێکردن ؟
کێشەی دووەمیش : سەگەکانیان بوون . دەمزانی هەر بە هۆی دوژمنداریەوە هەمیشە سەگی دڕیان هەیەو لەبەر خۆمەوە دەمگوت : خۆ هەر لە دوورەوە بۆنم بکەن بۆم دێن‌و ئاشکرا دەبم؟
کاتی خۆی بە هۆی هاتوچۆ کردنەوە سەگەکانیان دەیان ناسیم‌و هەرگیز تەشقەڵەیان پێ نەدەفرۆشتم ، بەڵام دوای نزیکەی سێ ساڵ کێ دەڵێ هەر هەمان ئەو سەگانەیان ماون ؟ یاخود ئەگەر ماشبن کێ دەڵێ دەمناسنەوە ؟
بە پارێز وبە ئەسپایی دەڕۆیشتم چونکە دەمویست تا دەگەمە بن هەیوانی ماڵەکە ئاشکرا نەبم، لەو پێناوەشدا زۆر بە نەرمی‌و وریایی دەچوومە پێش‌و هەر کە بە تەواوی نزیك بوومەوە دوو سەگی سپی‌و گەورە ڕاپەڕین‌و پێش ئەوەی ئەوان هاوار بکەن‌و پەلامارم بدەن من بە هەمان ئەو دەنگە تایبەتیەی پێشان دەنگمدانەوەو دیقەتمدا لە جیاتی حەوین‌و ڕەوین‌و پەلامار دەستیان کرد بە کلکەقوتێ کردن کە ئەوەش نیشانەی ناسینەوەو ڕاگەیاندنی پەیامی ئاشتی بوو ،بە دیتنی ئەو دیمەنە دڵم زۆر خۆش بوو ، ترس‌و گومانەکەم یەکسەر ڕەوینەوە . بە ڕۆخیاندا ڕەتبووم ، بەڵام تا چەند مەترێکیش دوور کەوتمەوە مەترسی ئەوەم هەر هەبوو پەلامارم بدەن‌و ئاشکرام بکەن ، گەیشتمە بن هەیوانەکەو ئۆخەیەکم لە خۆم کرد کە ئاشکرا نەبووم

. دیتم دایکی هەڤاڵ عومەر لەوێ لە ژێر هەیوانەکەدا نووستووە ، هەرچەندە من لەسەرە خۆ بانگم کرد ، بەڵام ئەو بە پەشۆکاوی بە ئاگا هاتو لەگەڵ چاو هەڵگلۆفتنو دیتنی مندا شاگەشکە بوو و لە حەپەساوییان نەیدەزانی چی بکاتو لەبەر خۆیەوە چەند جارێك لەسەر یەك گوتی :

– ئەوە خەونە ، یا ڕاستی !

– نەخێر ڕاستیەو چۆنن ؟

هەستایەوەو بە سۆزێکی دایکانە باوەشی پێداکردمو تێر تێر ماچی کردم ودەیگوت : قەت بڕوا ناکەم ئەوە تۆ بیتو گەڕابیتەوە !. زۆر خۆشحاڵ بوو، هەتا بڵێی یەك و دوو چووە سەربانو مژدەی گەڕانەوەی منی بۆ مام لاوەی مێردیو عومەری کوڕیو ئەوانەی تر برد . ئەوانیش بەو نیوە شەوە بە چاوی بەخەوەوە لە سەربان هاتنە خوارەوەو هێندە خۆشحاڵو ڕوو خۆش بوون بەو چەند دەقیقەیە هەموو ناخۆشیو هیلاکی ڕێگایان لە بیر بردمەوە . من سەرەتا پێم وابوو دەترسن ، بەڵام بە پێچەوانەوە ، لە ئازایەتیو جوامێریو بە پەرۆشی خزمایەتییان سەرم سوڕما،دواتریش پێم گوتن : دوو هەڤاڵی ترم لە گەڵدانو لەولا چاوەڕوانم دەکەن .

کاك عومەر یەکسەر هەستاو گوتی : دەچم دەیانهێنم .

–ئاخر ئەگەر بەیەکەوە نەچین ئەوان لەگەڵ تۆدا نایێن ، چونکە ناتناسن .

–کەواتە با بەیەکەوە بچینو چیتر چاوەڕوان نەبن .

چووین ئەوانیشمان هێنانو تا گەڕاینەوە کەریمی خاڵمو منداڵەکانیشی (کە بە هۆی ئەنفالەکانەوە کەوتبونە ئەو گوندە) ئاگادارکرابوونەوەو ئەوانیش هاتبوون . هەر بەو درەنگە شەوەشەوە نانیان بۆ ئامادە کردینو هێندەش دڵۆڤانو چاکن

بووین بە باشی پێمانەوە دیار بوو، بۆیە هەر ئەو کات زۆریان لێکردین کە خۆمان بشۆینو گیانمان پاکژ بکەینەوە . بەڵام ئێمە گوتمان :

–بەیانی  بە کاوەخۆ خۆمان دەشۆین .

ئەوان سەریان لەوە سوڕما بوو کە چۆن بەبێ دەنگیو بێ ئەوەی ئاشکرا ببم من گەیشتبوومە بەر دەرگای ماڵیان ! عومەر دەیگوت : خۆ ئەگەر لەولا بمدیبای ڕەنگ بوو تەقەت لێ بکەم .

مامە لاوەش دەیگوت : بە ڕاستی سەیرە ئەو سەگانە چۆن ڕێگەیان دای !؟

هەرچی دایکی عومەریش بوو دەیگوت : سەگ حەددی چیە بە مەلائیکەت بڕەوێ !

بەڵام مەسەلەکە ئەوە بوو کە سەگەکان هەمان سەگی جاران بوونو منیان ناسیەوەو ئەمەکداریی خۆیان پاراستو ئازاریان نەدام . هەڤاڵ موحسین دەیگوت : لەولای گوندەکە بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەر بە دەوردی ماڵی مام ڕەمەزانی برادەری هەڤاڵ فەرهاد بچین بەو درەنگە شەوەو لە ناو ئەو هەموو هێزەی دوژمن ڕوو لە کوێ بکەین ؟ قسەو باسی تری ئەو شەوە زۆر بوونو لە گێڕانەوە نایەن .

بەڵێ ، دوای یازدە شەوو ڕۆژ ڕۆیشتن بە برسێتی، بەماندوێتی، بەنەخۆشیو لە ناو مەترسیە گەورەکانی ڕێگاو بڕینی دەیان کیلۆمەتر لە شاخو دۆڵو دەشتو هەڵدێری چۆلەوانی ......... گەیشتینە یەکەم قۆناغی دەست نیشانکراوی خۆمان ..

"ئــــــــــــــــافــــــــــــــــریــــــــــــــــان"

* * * * *

لەوێ دوای خۆ شووشتن‌و تێر خواردن و پشوودان ؛ بە تەواوی هاتینەوە سەرخۆو گەشاینەوە ، بەڵام من قاچەکەم هێندەی تر پەنما بوو ؛ هەر لەبەر ئەوە بەرنامەیەکمان دانا کە من بۆ ڕاپەڕاندنی هەندی کارو چارەسەرکردنی قاچەکەم بمێنمەوەو فەرهادو موحسینیش بەلایەکی دیکەدا بڕۆن ، لەو پێناوەشدا شەوێك لە نزیکی گوندی حوجران بۆ جێبەجێ کردنی کارەکەیان ئەوان بە بناری سەفیندا بەرەو کۆیە ڕۆیشتن‌و من‌و عومەر لاوەش گەڕاینەوە دەشتی هەریر .

* * * * *

لە دەشتی هەریر هەواڵم بۆ ئەو هەڤاڵانە نارد کە پێویست بوو بیانبینم و (ساڵح شەهاب ، م. تالیب ، مستۆ زێباری) هاتنەلام و لە تەواوی دەنگو باسەکانی شارو شارۆچکەو ئۆردوگاکانی ناوچەکە ئاگادار بوومەوەو هەر لەوانیشم زانی کە ڕژێم ئەو ماوەیە بە هۆی خەریك بوونی بە کوێتەوە هێندێك نەرمیی نواندووەو ، تەواوی بازگەکانی نێوان ڕواندزو پیرمامی هەڵگرتوون ! دیارە هەر بە هۆی ئەو خەریك بوونەشیەوە بوو بوو کە لە ڕێگای هاتنمان ئەو چەند کەسانەمان بەرچاو کەوتبوون .

هەڤاڵ محەمەد حەسەنیش لە ڕواندزەوە هاتە لام‌و گوتی : وەستایەکی باشی شکستەم تێگەیاندووە کە بچینە لای‌و قاچەکەت هەڵبەستێتەوە ، هەروەها گوتی: خەبەری گەڕانەوەی تۆشم بە دایکم ڕاگەیاند ، بەڵام ئەو زۆر ترساو دەیگوت :

— چونکە وەزعەکە زۆر خراپەو ئەویش زۆر پێ ڕەشە !

هەر بۆ وەڵامی پلکە حەیات ئەو ڕۆژە ناردم لە هەریر جووتە گۆرەوییەکی زۆر سپیم بۆ هات‌و پێش ئەوەی شەو بەرەو ڕواندز بە ڕێ بکەوین کردمە پێیانم ، کە گەیشتینە ماڵی هەڤاڵ محەمەد

هەر لە حەوشەرا دەلینگە شەرواڵەکانم هەڵکردن بۆ ئەوەی تەواوی گۆرەوییەکە دیار بێ . هەر پلکە حەیات چاوی پێم کەوت ، گوتم :
– مەترسەو سەیرکە قاچەکانم چەند سپین ؟
ئەویش بە پێکەنینەوە گوتی :
– بە شەلینەکەتەوە دیارە ! ئەوە ئەوەشیان لۆ گێڕایەوە ؟!
ئینجا دوای چاکو چۆنیو ئەحواڵ پرسین گوتی : رۆڵە لێمان مەگرە ئەگەر بترسێین ، تۆ نابینی ئەو کافرە چی بەسەر ئەو میللەتە قوڕ بەسەرە هێناوە ؟
هەر ئەو شەوە چووینە لای حاجی محەمەد ئەمینی وەستای شکانو لە جێ چوون . دوای سەیر کردنو هەندێك بادانو سوڕاندن گوتی : ئەوە چۆن توانیوتە لە سەری برۆی ؟
–بۆچی ؟
–چونکە دیارە دەمێکە لەگەڵ چووەو ئازاری زۆری پێ گەیشتووە... ئەوە لە کوێ وات لێهاتووە ؟
–بڵێم چی ! لە ڕاو .
تا هێنایەوە شوێنی خۆی زۆر ئازاری دام ، ئەوجا هەندێك دەرمانی کوردەواری لەسەر دانانو گوتی : تا مانگێك لە سەری نەڕۆی .
هەرچەندە خۆم لای مام حاجی ئاشکرا نەکردو هەڤاڵ محەمەدیش هەروا ئاشکرای نەکردم ، بەڵام بەیانی ڕۆژی دواتر کچەکەی حاجی بە محەمەدی گوتبوو : شەوی ڕابردوو ئەو برادەرە لە ماڵی ئێمە بوو ، نەك ڕاوچی !
–چۆنت زانی؟
–زووتر ڕەسمێکی ئەوم دیبوو، هەر کە چاویشم پێی کەوت ناسیمەوە .

–زۆر ڕاسته ، بەڵام دەنگ نەکەی .
–بەسەرچاو ، چۆن شتی وا دەکەم .

* * * * *

ئەو ماوەیە تا هەڤاڵان لە کۆیە گەڕانەوە منیش سەردانی ( ڕواندز ، خەلیفان ، هەریر ، باسرمە ، شەقڵاوە..)م کردو بەردەوام هەڤاڵانو دۆستانو خەڵکی دڵسۆزم دەدیو ئەرکی سەرشانی خۆمان جێبەجێ دەکرد .
دەنگو باسەکانی بارودۆخی ناهەمواری نێوان عیراقو کوێت تا دەهات گەرمتر و ئەگەری پەلاماری عیراق زیاتر دەبوونو ئەو کاتیش چەند شەوو ڕۆژێك لە ئۆردوگای باسرمە لە ماڵی کاك محەمەدی مەدیلەی بووم ، منداڵێکی تەمەن شەش ساڵانەی قسە خۆشیان هەبوو ، ڕۆژێکیان بە گریانەوە گەڕایەوە ماڵەوەو منیش لێم پرسی : بۆچی دەگری ؟
گوتی :
– چونکە بە دوو منداڵان لێیان داوم .
منیش بۆ ژیرکردنەوەو بەرزکردنەوەی ورەی پێمگوت :
– جا دوو منداڵ چین ! ئەو کاتەی ئەمن منداڵ بووم ڕۆژێکیان شەش منداڵ هاتنە سەر ڕێگام و لە هەموویانداو وەکو تۆش نەگریام،ئەوە تۆ عەیب ناکەیت لەبەر دوو منداڵان دەگری هەی نامەرد !
غەمبار کە بە دەستە بچکۆلەکانی چاوەکانی لە فرمێسکی ناو تۆزو خۆڵ پاك دەکردنەوە سەیرێکی کردمو بە زمانە منداڵیەکەی خۆی گوتی :
– هەی ترسنۆك ئەدی ئێستا بۆچی لەبەر پیرەژنێکیش ڕا دەکەیت ؟! ها ترسنۆك؟

تۆمەز ئەو منی بینیوە کە هەر جارەی میوانێك بهاتایە دەبوو پێش دەرگا کردنەوە بە ڕاکردن بچمە ژوورێکی پشتەوە، بۆیە ئەو وا تێگەیشتبوو ئەوە لە ترسانە هەموو جارێ لەبەر خەڵکەکە ڕادەکەم ! ئیدی قسەی نەهێشتم و خۆشی بێدەنگ بوو .
لەو سەین و بەینەدا بەیانییەك زوو پێیان ڕاگەیاندم کە شتێك ڕوویداوە ، تەلەفزیۆنم کردەوە (کە نائاسایی بوو بە ڕۆژ T.V هەبێ) دیتم و بیستم هەواڵی هەڵهاتنی ئەمیری کوێت و دەست و پێوەندەکانی و( پوره الدیوانیات )ی کوێتیەکان ! و ڕاگەیاندنی ( الحکومه الکویتیه الحره المؤقته) بە سەرۆکایەتی ( علاو حسین) ڕادەگەیەنێ . ئیدی لەو ڕۆژەوە واتا ١٩٩٠/٨/٢ هەموو شتێك گۆڕاو دوژمنە زەبەلاحەکەمان دوژمنی لە خۆ گەورەتری بۆ پەیدا بوون ودواتریش بۆی هاتنە مەیدان .

* * * * *

هەڤاڵەکانم گەڕانەوەو منیش ڕێنمایی وەستاکەم پەیڕەو نەکردو پێش وەخت لەسەر قاچە زامدارەکەم ڕۆیشتم و دەستمان بە جەولە کردن کردەوە ، هەرلەبەر ئەوەش بوو زۆری نەبرد قاچەکەم وەکو جارانی لێهاتەوە ، کە هەم پەنماوەو هەم لەنگیمەوە .. ئەوکات بەڕۆژ وەك شەوگەڕو کوندەبۆ دەچووینەوە ناو کونە تاریکەکان و بە شەویش دەبووینەوە میری وڵات و بە ئازادی دەگەڕاین و دەسوڕاین . شەوێك لە نزیك گوندی سەرکەندی خەیلانییان ،لەو سەرکەندەی پێش ئەنفالەکان ڕۆژێك لەگەڵ هەژاری[2] شەقڵاوە سەرەڕای جیاوازی بیرو بۆچوونمان بە یەکەوە تەوزیع بووین و چووینەماڵێك ، لەوێ هاوڕێ هەژار وەکو خووی خۆی زمانی نەچووەوە کالانێ و هەر باسی خەبات و خەباتی

---

[2] دوای ئەنفالەکان بەکاربەدەری کۆنەپەرێنکی شەهید بوو .

چینایەتی بۆ ماڵەکە دەکرد ، نازانم بۆچی لەو کاتەدا پیرەژنە خاوەن ماڵەکە رووی خۆی لە هەژار کردو لێی پرسی : ئێوە چین ؟ ئەویش گوتی : من ئاڵای شۆڕش ..

پیرەژن هەر بە پێوە وەکو ئەوەی بەزەیی پێدابێتەوە سەیرێکی کردو گوتی : بە خوای کوڕم ئەنگۆ نابنە چ !

هەژار بە نیگەرانیو واق ورماوییەوە گوتی :

–بۆچی نابین بە هیچ پوورێ ؟

–چونکە هەند پەبە ئێکداچن ، هەند پەبەئێکداچن کەلکی ئێکدیوا بریە !

ئەوە بۆ من نوکتەیەکی خۆش بوو ، لە هەمان کاتیشدا بۆ چوونو هەڵسەنگاندنێکی سادەو سەرپێیی، بەڵام پڕ مانا بوو . لەوێ لە یەکتری جیابووینەوەو کاتو شوێنی گەیشتنەوە یەکتریمان دیاری کردنو ئەوان ڕۆیشتنو منیش بە تاقی تەنیاو بە شەلە شەل بەرەو دەشتەکە شۆڕبوومەوە .تفەنگێکی ژێ سێی پەرەشوتم پێ بوو ، زۆریش ماندوو بووم ، بەڵام وردە وردە هەر دەڕۆیشتم ،تا لە نزیک گوندی ئارمەندانو لە ناو بێستانێکی گندۆران دانیشتمو لە دڵی خۆمدا گوتم : پشووییەك دەدەمو تینیش گندۆران دەخۆم ئەوجا دەڕۆم . چەند گندۆرەیەکم لەو گندۆرە گەورەو بە تامو شیرینە بە ناوبانگانەی دەشتی هەریرلێ کردنەوە. هەر بەدەم بیرکردنەوەو ئەندێشەی بڵاوەوە ، بەو شەوە تاریکەو لەو دەشتە پانو بەرینو چۆڵەوانییە خەریکی کاڵەك خواردن بوومو لە پڕ سەرم هەڵبڕی ، دیتم دوو کەس لەملاو ئەولادا بە دووری بیست مەترێك رووی چەکەکانیان لە من کردووە .. ڕاچڵەکیمو یەکسەر خۆم لەسەر زگ ڕاکێشاو میلی چەکەکەم هێنایەوەو هاوارم کرد : کێن زەلام ؟

کەسیان وەڵامیان نەدایەوەو هەروەکو خۆشیان ڕەق ڕاوەستان !
دووبارەم کردەوەو گوتم قسە بکەن کوڕان !
هەر دەنگ نەبوو ، سەرم سوڕماو هەندێک هێور بوومەوە .
هەستامەوەو وردە وردە لێیان چوومە پێش سەیرم کرد دوو
ڕەنداورن و خاوەنی بێستانەکە بۆ پاراستنی گندۆرەکانی خۆی لە
باڵندەکانی ڕۆژو دەعباکانی شەوان لە شێوەی زەلامی چەکداری
دروست کردبوون و بە ڕێکەوتیش ڕوویان لەو شوێنە بوو کە من
لێی دانیشتبووم !.
لەوێ بە تاقی تەنیا ، لە بەر خۆمەوە هێندە پێکەنیم،هێندە
پێکەنیم هەرگیز جارێکی تر ئەوەندە پێنەکەنیم !.

* * * * *

نیسان لەگەڵ هەڤاڵان یەکتریمان گرتەوەو
بارودۆخەکەش زۆر بەرەو باشی چوو ، چونکە هەم لەگەڵ
هەلومەرجەکە ڕاهاتین، هەم بە هۆی داگیرکردنی کوێتەوە ،
خەڵکەکە ئامێکیان وەبەر هاتەوەو ترسیان ڕەویەوەو زیاتر
هاوکاریان دەکردین و باشتر گوێیان لێ دەگرتین .
ڕووی ڕاگەیاندنی هەموو دنیا لە کوێت بوو ، حکومەتی سەدامیش
لە لایەک جەنگە خوێناویەکانی لە کوێت توند گیرو گوێکانیشی لە
دەنگی ئەنجومەنی ئاسایش و وڵاتانی تری دنیا قوڵاغ کردبوون .
کوردستانیش لە کڕی و خامۆشی پێش گەردەلولدا زامەکانی خۆی
تیمار دەکردنەوە .. تا دەش هات ئەستێرەی ڕژێم بەرەو کزی
دەچووو لەبەر چاوی خەڵکیشدا بچوک دەبووەوە ....
لەو هەلومەرجەدا، ئومێد چەکەرەی دەکرد .. چاوەکان
دەکرانەوە .. بڕینەکان دەکولانەوە .. بیرەوەریەکان

دەبوژانەوە.. هەنگینیێ سەرەڕای تێکۆشەرانی نهێنی خەڵکی سادەشمان زۆردەدیت‌و زۆریەیان دەیانگوت :
–با کوێت هەڵیگرتێتەوە .. سەدام کاری لە کار ترازا .. شەڕ کەوتە ناو ماڵی خۆیان .. لە سەدام قبول ناکرێ .. ئەمریکا لێی دەدا .. سعودیە پساوە ... ! قسە دەبیسران‌و دەکرانەوە ..
گیانی هەستانەوە دەبوژایەوەو ئومێدیش گەشەی دەکرد . .....
ڕێگاکە درێژەی هەبوو ئێمەش لە وەرزی سەوز بوونی بەرو بوومی دەیان ساڵەی خەبات‌و قوربانیداندا لە چارەڕوانی مەرگدا ئارەقەی ئەرکی ڕێگای یاخیبوونمان لە ستەم‌و داگیرکاری دەتکاندەوەو ڕەنگی نیشتمانیش بەرەو گۆڕان دەچوو
..................................

فەرمەنگۆکە

ئاقاستی : ڕاست بەراستی
لێراهێ : لەوێ
ئەوەندۆکە : کەمێك
ئیکدیو : یەکتریتان
بەخۆژی: بەخۆژیو ، خۆپەرست
بێن : پشوو
بەریوونەوە : کەوتن
ببێم : بڵێم
بەردی برا برایی : لەیەکتری هاوێر بوون
باسك : باڵ
پە : بە
پەرچ : دڕکەڵان
بەرێ : بەڵێ
پیل: شان
پەبە ئێکداچن : دەمدەمانێو موناقەشە لەگەڵ یەکتریدا دەکەن
پێشکە : مێشوولە
پلك : پوور
تات : بەردە نوێژ
تەقەتکردن : شاردنەوە
تەزی : سارد
تریقژن : تریقە
چەور : گیایەکی کوێستانە
پاگژ : خاوێن
پێرەش : سەربە بەڵا
چاك : پیاو چاك ، گۆڕستان
چۆڕ چۆڕە : دڵۆپە
چەقەر : چەقەڵە بەرد
هەرەتە : هاوێر
هیشك : وشك

هەژمەت : داخ
هەركەو : ماقۆر ، چاڵە ئاوی ناو بەرد
هنداو : سەر ، هنداڤ
سوختە : فەقێ
سایە : ناوی کوێستانێکە
سەروچاوی باران : ناوی کانی یەکی گوندی مەلەکانە
سوولی : تاڤگە
سانەوە : حەسانەوە
کوتەك شکاندن : رێگاکردنەوە لە بەفردا
کلوە بەفری کەچە پەڕۆ : کلوە بەفری گەورە گەورە
کاڕك : نەگەیو ، کاڵ
کوندەبۆ: کەندەپەپوو
کێل بوونەوە : هەستانەوە ، بەرەو هەوراز بوونەوە
کەپوو : لووت
کوتکە هەنار : هەناری نەگەیو
گورە : جولە
مار : ماڵ
مشەقەتی : هیلاکی
مزەورە : شلە
خورت : بەهێز ، گەنج
خش حشۆکانێ : خلیسکان
خشتو گێرە : کەڵ کەڵە
گیر : تاخیر
گیرۆ : گرفتار
قیت بوونەوە : هەستانەوە
قاپی دار : بنە دار
دژ : تۆفو توش
دەستوەکەر : بەرگری
دژوون : چڵکن
دەوار : وڵاخ

دوڕ : ناو
دۆت مەلا : کچەمەلا (ئەو ژنەی قورئانی فێر دەکردین)
دەقنە : قوڕاو
ڕەنداور : داوەڵ
دەست کەسك : پیرۆز
زێلاق : لیتە
لەگوینە : ڕەنگە ، لەگینە
ڕابەستان : ڕادێران
ڕەوین : وەڕین
شەقی : ماندی ، ماندوو